پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان (٢٩)

# فرۆید

## لە تەرازووی ژێرییدا

نوسینی :

مامۆستا موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری



زنجیره پەیامەکانی گۆڤاری ڕێنوێن ژمارە (٢٩)

📖 ناوی کتێب: فرۆید لە تەرازووی ژیریدا
✍ نوسینی: موحەممەد صالح ئەبوبکر شارەزووری
* ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان
* ژمارەی زنجیرە: ٦
* تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
* نۆبەی چاپ: دووەم
*ساڵی چاپ: ٢٠١٥
* ژمارەی لاپەڕە: ٢٨٠ لاپەڕە
* دیزاین: ڕێنوێن
* پێداچوونەوەی: کۆچەر محمد مەلا صالح
* چاپ: چاپخانەی ڕێ نوێ
* نرخ: تەنها (٥٠٠٠) دینار
* سەرپەرشتیکار: سەرکۆ کریم احمد
* ئیمەیل: renwen2009@yahoo.com
* ماڵپەڕ: www.aubyc.com
* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٤٢٤)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

**خوای گەورە ئەفەرمێ:**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا
﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا ﴿١٠﴾ ﴾

**﴿ سورة الشمس ﴾**

**فرۆید :**

**بەهەشت:** کاکە گیان یاخوا لە (عەمرە)کەت بەخێر بێیتەوەو خوا لێت وەرگرێت و نزاکانت قبووڵ بکات.

**نەورەسی:** سوپاست دەکەم خوشکێ گیان، داواکارم خوای گەورە تۆیش لەو سەفەرە گیانییە بێبەری نەکات.. بەڕاستی لەوێش هەر دڵم لاتان بوو، لە هەموو جێگا پیرۆزەکاندا پاڕانەوەی بە کوڵم بۆ کردوون.. بەڵام بەداخەوە..

**بەهەشت:** بۆچی.. خوا نەخواستە چی بووە.. ؟!

**نەورەسی:** وەڵڵا لەبەر ئەوەی تۆم لەتەك نەبوویت و ئەگەر پێکەوە بووینایە گەلێ خۆشتر ئەبوو..

**بەهەشت:** ئەی زۆر خۆشتر ئەبوو.. بەڵام نەخشەی خوایی جیایەو نەخشەی ئێمە جیایە.. ئێمە داماننابوو ئەم ڕەمەزانە (١٤٠١) کە قوتابخانە نیە و پشووی هاوینە لە باخەبەڕە[1] بگرین و ئەو مانگە لەوێ بەسەر بەرین، بەڵام گرتنی مامۆستا لە لایەکەوەو کۆچی ـ هدی خان ـ لە لایەکی ترەوەو دواییش کە مامۆستا لە بەندیخانە ڕزگار بوو هاتەوە، سەرلێشێواوی خەڵکی ئەو ناوچەیە ( بەهۆی جەنگی عێراق و ئێرانەوە) بووە سەرباری

---

[1] - باخەبەڕە/ ناوازەترین باخەکانی بیارەیەو باخی ماڵی باوکی (هدی)ی جوانە مەرگە بوو.

هەمووی و بونە پاڵپشتی تێکچوونی نەخشەی ئێمە.. تۆیش ڕەمەزانەکەت برد بۆ ـ مەککەی پیرۆز. بەهەر حاڵ من زۆرم زیان لێ کەوت، ئەبووایە ـ باخەبەڕە ـ ی ئەمساڵ ببوایەبە خوێندنگای من و تۆ باسی (فرۆید)و (فرۆیدیزم)ت لەوێ بۆ بکردمایە وەکو خۆت پەیمانت دابوومێ.

نەوڕەسی: بەهەشت گیان شێوەی مردنی (هدی خان) زۆر ناسۆرە و لەیاد ناچێتەوە.. بەڵام باس کردنی فرۆید و ڕاکانی لە دەس دەرناچێت.

بەهەشت: جا کەی بۆم باس دەکەی..؟

نەوڕەسی: پەلەت چییە..؟ کەی فرۆید ئەو نرخەی هەیە موسڵمان خۆی پێوە خەریك بکات.. کابرایەکی زایۆنی (صهیونی) بێ ڕەوشت و فێڵبازو گورگ و لەپێستی مەڕدا.. بۆ وا کەوتۆتە سەر زمانت..؟

بەهەشت: کاکە گیان ئەوە تۆ دەڵێی چی..؟ ئەڵێی ئاگات لەو هەموو دەهۆڵە نیە بۆ فرۆید لە هەموو سەرانسەری جیهاندا. لێ ئەدرێ.

نەوڕەسی: چۆن ئاگام لێی نییە.. تەنانەت ئاگام لە نووسینی کوردییە، چۆن بە شان و شکۆی فرۆیدییزم و پێنوسە ژاراوییەکانی تردا دێت. هەوڵ ئەدا بەرگی خووڕەوشتی کچە

کوردە ڕۆشنبیرەکان دابکەنێ و فرۆیدیزم بکاتە (مینی جۆب) و بیکاتە بەریان، سەیری گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (٤٨)ی ساڵی ١٩٧٨ و نووسینەکانی (محمد رشید فتاح) بکە، یان سەیری هەمان گۆڤار ژمارە (٥٤) و نوسینەکانی ئارام بکە.

بەهەشت: خوێندومەتەوەو ئاگام لێیانە.. بەڵام خەریکە سەرم سوڕ بمێنێ تۆ فرۆید بەگورگ و بێ ڕەوشت و فێڵباز ناو ئەبەیت و (محمد رشید فتاح) لەو گۆڤارەو (ل٦١ ستونی یەکەمدا) ئەڵێ (لە ڕاستیدا فرۆید بە پێشەوای زاناکانی جیهان دادەنرێت) و لە دوو لاپەڕەو نیوەی گۆڤارەکەدا پێنووس با دەداو ئارەقی زەردو سوور بە خۆی دەڕێژێ بۆ بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە بۆ فرۆید و فرۆیدیزم.

نەوڕەسی: ئەویش دەستێکە، ئەگینا بۆ لە هەموو سەراسەری نووسین و ئامێرەکانی ڕاگەیاندنی کوردیدا باس و خواسێکی مامۆستای پایەبەرزی کورد (بدیع الزمان) سعید نەوڕەسی و هەزارانی تر زانای پایەبەرزی نەتەوەکەمان کە ناویان ون و بێ سەرو شوێنەو تا ئێستا نووسەرێکی کورد باسی نەکردوون.. جگە لەوەی لەم ساڵانەی دواییدا مامۆستا (فاروق رسول یحیی) خوا پاداشتی بداتەوە هەندێ نامیلکە و فەرموودەکانی مامۆستا نەوڕەسی بەچاپ گەیاند. سەرکەوتوو سەرفراز بێ.

بەهەشت: ئێستا من هەقم بەسەر ئەم گلیەییانەوە نیە، ئەمەویٚ فرۆیدم بۆ بخەیتە تەرازووی ژیرییەوە.

نەوڕەسی: بڵێم چی.. کورد ئەڵێ ( شەڕەو یەخەت ئەگریٚ، ئەگەر نەیکەی خوا ئەتگریٚ ) باشە بەسەر چاو بەهەشت گیان لە ئەمشەوەوەو پاش ئەوەی نوێژی خەوتنانمان بە (جەماعەت) کرد تا کاتی خەوتن لە ژوورەکەی مندا، (فرۆید)ت بۆ هەڵپێچ دەکەم و دەیخەمە شایەنەکەوە.

بەهەشت: سوپاس کاکە گیان.. خوا تۆم لیٚ نەسێنیٚ.

....................

بەهەشت: بەڵیٚ کاکە گیان.. هەموومان ئەزانین (فرۆید) باوەڕی بە ڕەوشت و بە ئایین نیە و ئەمانە بە کۆت و زنجیر ئەزانیٚ، گوێدان بە وشەی شەرەف و ئابڕوو شتێکی ڕاست نییە، لای فرۆیدیزم باوی ئەوە نەماوە باسی داوێن پاکی و داوێن پیسی بکرێت، چونکە مەسەلەی جنسی مەسەلەیەکی بایۆلۆجی ڕووتە پەیوەندی بە ڕەوشتەوە نییە.. کاتی ئەوە هاتووە سەربەستی بدەین بە خۆمان و لە پاڵەپەستۆکانی داخوازی لەش و ئارەزوو ڕزگار ببین و چاکی فرمان کردن و بەرهەم هێنانی لیٚ بکەین بەلاداو، گرنگ ئەوەیە کارگە کار بکات، ئیتر گوێدان بە تێکەڵاوبونی ژن و پیاو، یان کوڕو کچ تامەزرۆ و بەتاسە بۆ

یەکتری، بیرەوەرییەکی کۆنەپەرستانەیە.. وە ئەوی ئێمە بەرگوێمان کەوتبێ فرۆید باوەڕی بە هیچ ئایینێك نەبووە. مرۆڤی بە گیانداری جنسی ڕووت داوەتە قەڵەم. لای فرۆید (ژیانە جنسە) لەوە بەولاوە دروستکراو ڕپڕووپاڵانتەیەو.. هتد.

ئەمەش لەخۆیەوە نەیگوتووە بەڵکو خۆی پزیشکێکی دەروون ناس و پسپۆڕ بووەو لەژێر تیشکی توێژینەوەی زانستیدا ئەم بڕیارانەی دەرکردووە..

جا نازانم تۆ دەڵێی چی..؟

نەوڕەسی: پێش ئەوەی باسی بیروباوەڕی (فرۆیدیزم) و ڕاکانی (فرۆید)ت بۆ بکەم پێویستمان بە چەند ڕوونکردنەوەیەك هەیە پێویستە چەند خاڵێکت بۆ باس بکەن.

بەهەشت: فەرموو.

نەوڕەسی: خاڵی یەکەم، پێویستە بزانین فرۆید کێیەو کوێنەرییە؟

خاڵی دووەم، بزانین ئایا ڕاستە فرۆید هیچ ئاینێکی نەبووە؟

خاڵی سێهەم، بزانین تا چ ڕادەیەك فرۆید پابەند و کەمەنکێشی تیۆری داروێنیزم بووە؟ ئەو کاتە ئەتوانین باسی فرۆید و فرۆیدیزم بەگشتی بکەین.

بەهەشت: ڕاستە ئەم خاڵانە پێویستە.

**نەوڕەسی:**

**١. (سگمۆند فرۆید = Sigmund Freud) ئەو بەچکە جووە بوو کە لە ساڵی ١٨٥٦ لە ولاتی (نەمسا) و لە پارێزگای (مۆرافیا) و ناوچەی (فریبورگ) کە ئێستا سەر بە (چکۆسلوڤاکیا) یە لەدایك بووە[٢] تەمەنی چوار سالان بوو کە مالی باوکی کۆچی کرد بۆ پایتەخت (ڤیەننا)، ئەم کۆچکردنەی مالی باوکی لەبەر کەم دەرامەتی و نان پەیداکردن نەبووە، بەڵکو بەهۆی پالەپەستۆی گران و کۆیلێتی جوولەکەکانی ئەو سەردەمەدا بوو باوکی دەیویست بڕواتە پایتەخت و خۆی تێدا حەشار بدات.. فرۆید پێگەیشت و کۆلیژی پزیشکی تەواو کرد و لە ساڵی ١٨٨٥دا بۆ خوێندن ڕۆیشت بۆ فەرەنسا.. لە ساڵی ١٨٩٢ وە لە تەمەنی ٣٦ ساڵانیدا چووە ڕیزی کۆمەڵی (بنای پرث)ی زایۆنی و بووە ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵەکە.[٣]**

**پاش گەڕانەوەی لە فەرەنسا بۆ ( ڤیەننا ) دیسان لەڕێی خەبات و تێکۆشانی بۆ زایۆنی و لەترسی هێرشی نازی ڤیەننای بەجێهێشت و تا دیسان لە ساڵی ١٩٠٢ گەڕایەوە بۆ ڤیەنناو کرا بە مامۆستای نەخۆشی شێتێتی و ئەعصاب لە زانکۆی ( ڤیەننا)**

---

[٢]– سەرەتای کتێبی (الهستریا) بەرگی یەکەم. ل٩.

[٣]– نظرية فرۆيد/ محمد علي الفلاحي ص٦.

هەتا ڕۆژی ١٩٣٩/٩/٢٣ له تەمەنی ٨٣ ساڵیدا له جنس بازی کەوت و بە نەخۆشی شێرپەنجە مرد[٤]

٢. بۆ ئەوەی دۆری ئەوانەت بۆ دەربکەوێت کە ئەڵێن. فرۆید بێ باوەڕو (ملحد) بووە و پابەندی هیچ ئاینێك نەبووە ئەڵێم:

أ. فرۆید خۆی ئەڵێ ( ڕۆژی ٦ی/مایس -مایۆ/ ١٨٥٦) له شاری فیریبۆرگ ی مۆراڤیا له کۆماری (چیکۆسلوڤاکیا) ئێستا لەدایك بووم و باوك و دایکم جوولەکە بون و منیش بە جوولەکەیەتی بووم هەر وایش ئەمێنمەوە[٥] بەهەشت گیان له وشەی (هەروایش ئەمێنمەوە) ورد بەرەوە...

ب. سەیری کتێبی (موسی والتوحید)ی فرۆید خۆی (ل٨١، ٨٢) بکە، کە ئەڵێ (کاتێ ویستم ئەم کتێبە بڵاوبکەمەوە ئەمزانی کە تووشی چەرمەسەرێ و دەربەدەری ئەبم نەك تەنیا لەبەر ڕاکانی ناو کتێبەکەم بەڵکو لەبەر (ڕەگەز)ەکەم. چونکە جوولەکەم..

ج. بەهەشت گیان، ئەگەر سەیری هەموو نووسینەکانی (فرۆید) بکەین هێرشی بۆ سەر هەموو ئاینێك تێدایە تەنیا بۆ سەر ئایینی (جوولەکە) نەبێ.. له سەرانسەری هەموو نووسینەکانیدا تاقە هێرشێکی بۆ سەر ئایینی جوولەکە نەکردووە.. بەڵکو بە

---

[٤]- الهستريا/ ل١١-١٢.

[٥]- صراع مع الملاحدة حتى العظم/ ل٢٣٢

پێچەوانەوە زۆرجار باسی پیاوەتی و گوستاخی ئایینی جوولەکە ئەکات بەسەر مرۆڤایەتی و گرۆی ئادەمیزادانەوە.[٦]

جوولەکایەتی فرۆید وەکو جوولەکەیەتی (بن گوریۆن) وابوو کە بە سەرزارەکی خۆی بە بێباوەڕو (ملحد) پیشان ئەدا کەچی هەموو ژیانیشی بۆ کارگوزاری زایۆنی جیهانی تەرخان کردبوو.[٧]

د . فرۆید وەکو جولەکەیەکی سادە نەئەژیاو بەڵکو ئەندام بوو لە کۆمەڵی (بنای پرث)ی زایۆنی ماسۆنی.. ئەم کۆمەڵە هەڵبژاردەی کۆمەڵانی (ماسۆنی)ن، جوولەکەی تێکۆشەر نەبێ لەم کۆمەڵەدا وەرناگیرێت[٨] وە کاتی تەمەنی فرۆید گەیشتە حەفتا ساڵی بەهۆی کارگوزاری دڵگەرمانە و دڵسۆزی فرۆید بۆ ئەم کۆمەڵە زایۆنییە.. کۆمەڵەکە بڕیاری دا ئاهەنگێك بگێڕێت بۆ فرۆید.. بەڵام فرۆید خۆی بۆی نەکرا لە ئاهەنگەکە ئامادەبێ بەڵکو پزیشکە تایبەتیەکەی خۆی (پرۆفیسۆر لیدڤیج براون)ی نارد بۆ ئەو ئاهەنگەو لەجیاتی فرۆید وتارەکەی خوێندەوە کە تێیدا وتبووی (بەڕاستی جوولەکایەتی ئێوەو هەڵوێستی جوولەکانەی

---

[٦]- کتێبی (موسى والتوحيد) بخوێنەوەو سەیری کتێبی (الوجوديه و واجهات الصهيونيه) ل/٤٠٠ بکە.

[٧]- سەیری صراع مع الملاحدة حتى العظم/ ل٢٣٢ بکە.

[٨]- نظرية فرويد، دراسة وتحليل، ل ٦، وە کتێبی (صراع مع الملاحدة حتى العظم) ل٢٣٦-٢٣٨، و الوجودية وواجهات الصهيونية، ل٣٧.

ئێوەم زۆر بە دڵەو بەتەواوی لەگەڵتانم.. چونکە منیش وەکو ئێوە جوولەکەم.. زۆر باش لێم ڕوونە، ددان نەنان بەم ڕاستییەدا نەوەك تەنیا کردەوەیەکی دژ بە ڕەوشتە، بەڵکو کردەوەیەکی کەریەتی و گێلێتییە..

ئەو پەیوەندییانەی من ئەبەستێ و شەکەتم ئەدات بە جوولەکایەتییەوە زۆرن.. زۆرجار سۆزی جوولەکایەتی و جوولەکە بەشێوەیەك تاوم ئەکات و تەفرەدانی ڕەگەزی (الأغراء الجنسي) و بۆ دروست ئەکات، بە هیچ شێوەیەك بەربەرەکانێی ئەو سۆزەم بۆ ناکرێت.. سۆزێکی بەهێز.. هێزێکی هەڵچووی شێتانەی زۆر شاراوایە، هەتا ئەو هێزو سۆزە زیاتر بێ وشەو ڕستە دەسە پاچەترە لە ڕاڤەکردن و دەربڕینی بە زمان.

.. ئا بەم شێوەیە خۆمم دۆزییەوە کە منیش یەکێکم لە ئێوە هەڵئەسم بە هەر فەرمان و دەورێك کارگوزاری کارە مرۆڤایەتی و نەتەوایەتییەکانی ئێوە بکەم...)[9].

هـ ـ جارێك لە (فرۆید)یان پرسی کە ( ئایا تۆ نەمساویت یان ئەڵمانیت ) وتی ( من پێش ئەوەی خەڵکی هەرکوێ بم، جوولەکەم..)[10].

---

[9]– هەمان سەرچاوەی پێشوو .

[10]– صراع مع الملاحدة حتى العظم، ل٢٣٦.

و. (ماکس گراف)ی زایۆنی ئەڵێ (زۆرجار دیدەنی فرۆیدم ئەکرد و سەرم لێئەدا. . لە سەردانێکمدا وتم بە فرۆید. ئەوە تۆ ڕات چییە ئەگەر منالەکانمان ڕێنموونی بکەین کە ئایینی گاورێتی (مسیحی) وەربگرن و واز لە جوولەکایەتی بهێنن.. سەیرم کرد فرۆید زۆر تووڕە بوو بە پەرۆشییەکەوە تووڕەییەکەوە وتی . ئەگەر منالەکەت بە جوولەکایەتی پەروەردە نەکەیت لە هەستی جوولەکایێتی بێ وەری بکەیت، لە وزەیەك بێ بەشی ئەکەیت کە بە هیچ شتێك قەرەبوو ناکرێتەوە. منالەکەت پێویستە وەکو جوولەکەیەك تێکۆشەر بێ. تۆیش پێویستە وزەی جوولەکایەتی لە دەروونیدا بڕوێنی و گەشەی پێبکەیت و پاڵ پێوەنەر و ڕێ پیشاندەری بی..)[11].

ز. بەهەشت گیان.. ئەم جوولەکانە . فرۆید، مارکس، دورکایم، ئینگلز.. هتد...

کاتێ خۆیان بەبێ بڕواو (ملحد) پیشان ئەدەن و خۆیان ئەکەنە توێژەرێکی زانستی ڕووت، یەك تاقە مەبەستیان هەیە ئەویش ئەوەیە (کاتێ ئەمانە باوەڕی گاوڕێتی (مەسیحی)یان لەپێش چاوی لاوەکانی ئەورووپا سووك کردوو پەیوەندی خواپەرستییان لەدڵیانا نەهێشت و هەروەها ئەگەر لە ڕۆژهەلات باوەڕی

[11]- الوجودية و واجهات الصهيونية، ل٣٦-٣٧.

ئیسلامییان لەلای لاوە موسڵمانەکان سووك کردو لە وزەی خواپەرستی بێ بەشی کردن.. ئەو کاتە سەراسەری زەوی تەخت ئەبێ بۆ جوولەکەو بە ئارەزووی (حاخامەکانی کەنیسێت) جوولەکە شەن و کەو ئەکات چۆنی بوێ مەنی خۆی لێ ئەپێوێ.. ئەگینا جوولەکە پێش ئەوەی هیچ شتێك بێ جوولەکەیەو هەر بیرو باوەڕێکی تر هەڵبگرێ یان دروستی بکات، بۆ کارگوزار و جوولەکایەتیەکەیەتی[١٢]..

ح ـ بەهەشت گیان سەیری کتێبی (موسى والتوحيد)ی فرۆید خۆی و گۆڕینی نوسەری مارکسی (جورج تەرابیشی) بکە بزانە چی ئەڵێ.

بەهەشت: چی ئەڵێ..؟

نەوڕەسی: هەموو سەراسەی کتێبەکە پیاهەڵدان و بالۆرەیە بە جوولەکایەتی و زایۆنیدا.. بۆ نموونە سەیری ل٩١ بکە کە ئەڵێ (جوولەکە ئەبێ ببن بە گەلی هەڵبژاردەی خوا.. و ئەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان گەلی جوولەکە لەسەر ئەو خۆگری و پابەندی و گوێڕایەڵییەی تایبەتییان، پاداشتێکی تایبەتی بدرێنەوە.. سەرپێچی ناکرێ لەوەی ئەم گەلە ـ گەلی جوولەکە ـ هەندێ چەرمەسەری و ئەشکەنجەیان هاتە ڕێ، بۆ ئەوەی بزانن مانای

---

[١٢]– سەیری کتێبی العقدة النفسية والشعور بالنقص، ص ٦٥.

جیاوازی ئەوان لە گەلانی تر چییە.. بۆ ئەوەی لەو مانای جیاوازییەی گەلی تایبەتی خوا، بگەن..).

بەهەشت: گوایا ئەو نوسەرە کوردە ـ بەناو موسڵمانە ـ بەم ڕەگەز پەرستیە جوولەکانەی فرۆید نازانن و ئەو کتێبەیان بەردەست نەکەوتووە..؟

نەوڕەسی: چۆن بەر دەستیان نەکەوتووە، لە زۆربەی کتێبخانەکان هەیەو بەڵام زۆر کەس هەیە جاشی جووەو خۆی بە خۆی نازانێ.. ئەگینا پاش ئەم وتانەی فرۆید (خۆی) و لە کتێبی خۆیدا ئیتر ڕەوایە بۆ هیچ کەس بڵێ، فرۆید توێژەرێکی زاناو بێلایەنە و (ملحدە).

بەهەشت: نەوەڵڵا.. وتەکانی جوولەکایەتی لێ ئەچۆڕێ.

نەوڕەسی: بەهەشت گیان.. فرۆید یەکێکە لەو گورگانەی کەوڵی مەڕیان پۆشیوە.. کاتێ کە باسی ئایینەکانی تر ـ ئیسلام و مەسیحی ـ ئەکات.. ئایین لە ڕووداوێکی ناشەریفانەو دەست درێژی کردن بۆ شەرەفی دایك و کوشتنی باوکەوە، دروست بووە بەڵام، کاتێ ئاوڕ بەلای جوولەکایەتییەوە ئەداتەوە، ئای چ جوولەکەیەکە..!

بەهەشت گیان، هەمان کتێب (موسی والتوحید) لاپەڕە ١٧١ بخوێنەرەوە کە ئەڵێ (.. ئا بەو شێوەیە دیمان کە (موسی) چۆن

سروشتێکی بۆ جوولەکە دروست کرد.. ئایینێك کە متمانەیان بە خۆیان پەیدا کردوو بە شێوەیەك پشت سوری ئەو ئایینە بون خۆیان ئەشکانەوەو خۆیان گەورەتر ئەگرت بەسەر هەموو سەراسەی گەلانی جیهان..) هتد.. زۆر شتی تر..

ئا بەم جۆرە بۆت دەرکەوت فرۆید بێ ئایین نەبووەو بەڵکو جوولەکەیەکی ڕەگەز پەرستی زۆرزان بووەو هە ر کەسە فرۆید بە بێ ئایین بزانێ ئەوە خۆی بێ ئایین و گێلە و لێی نازانێ.

بەهەشت: باشە چی پاڵی نا بە فرۆیدەوە بۆ ئەم دوو ڕوویی و تاکتیکە..؟

نەوڕەسی: بەهەشت گیان، کاتی لەدایك بون و گەشەکردن و پێگەیشتنی فرۆید . وەکو بەچکە جوولەکەیەک دۆخێکی زۆر ئاڵۆزو پڕ لە ناسۆرو ئەشکەنجەو ئازار بوو بۆ هەموو جوولەکەی سەراسەری زەوی.. جوولەکە، کەمایەتییەکی پرش و بڵاوی ژێر چەپۆکەی بێنرخ بون لە سەراسەی زەویدا.. بەتایبەتی لەو وڵاتەی ئایینی مەسیحی دەستی درێژ بووایە توانای دەست وەشاندنی ببوایە ئەوە قورە ڕەشە گیرابووەوە بۆ جوولەکەکانی ئەو وڵاتە. .

لە مێژووی دوورو درێژی جوولەکەدا پشوویان بەخۆیان نەدیوە.. ئەو چەند سەدەیە نەبێ لەژێر سایەی ئیسلامدا

ئەژیان.. کە لەو ماوانەدا هەموو سەربەستییەکی بیروباوەڕو بازرگانی و شان بە شانی موسڵمانێکی ئەندامی دەوڵەتەکە مافی هەبووە.. چونکە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامدا هەر کەسە چ بیروباوەڕێکی هەبێ چ ئایینێکی هەبێ ئازادە.[١٣]

بە ئاوابونی خۆری شارستانیەتی ئیسلام و دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلام، جوولەکە وەکو قۆلانچەی ناو سرکەیان لێ هاتبوو لە هەر قوژبنێکی ئەم سەر زەوییەدا سەریان بەرز بکردایەتەوە سەریان ئەقرتاندن خۆ لە ئەوروپاو جێگای لەدایك بونی فرۆید قورەکەی لە هەموو جێگایەك خەستتر بوو.. کاتێ ڕۆڵە جوولەکەیەك لەدایك ئەبوو، دایك و باوکی بە ڕق و کینەبەرایەتی گەلانی تر گۆشیان ئەکرد..

کە چاوی ئەکردەوە لە قسە ئەگەیشت تێیان ئەگەیاند جوولەکە بێڕێزترین و ناشرینترین دروستکراوی خوایە لەبەرچاوی ئەو خەڵکەی چواردەوری.. خۆ فرۆید خۆی زۆر چێشتخانەی دیوە لە ئەوروپا لێی نوسرابوو (قەدەغەیە هاتنە ژوورەوەی سەگ و جوولەکە..)[١٤].

---

[١٣]- سەیری کتێبی ( حقوق الأنسان بين تعاليم الأسلام واعلان الأمم المتحدة ص١٠٠-١١٠ ) وە کتێبی ( الدولة القانونية والنظام السياسي الاسلامي ص ١٨٠-١٨٣ ) بکە.

[١٤]- سەیری کتێبی ( الأنسان بين المادية والأسلام ) ص٢٩ بکە.

جوولەکە لە هەموو سەراسەری زەویدا بە نەتەوەو کۆمەڵێکی زۆر ماددی و چاو برسی و چاو چنۆك و مادده پەرست سەیر ئەکران. وا باو بوو کە جوولەکە ناشرینترین کردەوە ئەکات بۆ مادده..

(فرۆید) لاوی جوولەکە و بلیمەت، کاتێ چاوی لەم جیهانە تەنگە و ژیانە تەسکەدا هەڵهێناو سەیری بارودۆخی ژیانی نالەباری نەتەوەو هاوئایینەکانی کرد.. لە هەناسەی سارد هەڵکێشان و ئاخ و ئۆف کردن بەولاوە چی تری دەسەڵات نەبوو.. هەر فووی ئەکردە خۆی و لێوی ئەگەست لە هەموو دانیشتوانی سەر زەوی بەگشتی شوێنکەوتووی ئایینەکانی مەسیحی و ئیسلام بەتایبەتی.. وە بڕیاری دا بەسەریانەوە نەڕواو تۆڵەی هەزاران ساڵی جوولەکە بسێنێ... بەڵێ ئەوە بوو بەناوی زانیارییەوەو لەژێر پەردەی شیتەڵ کردنەوەی دەروونیدا و بەناوی ناسین و ناساندنی توێ توێی دەروونی مرۆڤەوە تۆڵەی کردەوە...

وتی خەڵکینە، بۆچی ئێوە تەنیا بە (جوولەکە) ئەڵێن مادده پەرست و چاوچنۆك.. لێم ڕاوەستن بزانن چۆن هەموو ئایین و ڕەوشت (قایم)ێکی (ئێوە) بۆتان لیخن ئەکەم و بزانن چۆن ئەتانکەم بە ئاژەڵێکی ڕووت..

بزانن چۆن ئەتانکەمە بەندەی جنس و ئەوی پێی بڵێن شەرەف و کەرامەت و ڕێزو پیرۆزی و ئایین و کۆمەڵ و ڕەنجی هەزاران و ملیۆنان ساڵەی گرۆی مرۆڤایەتی، هەر هەمووتان وا بۆ ناشرین ئەکەم بێزی لێ بکەنەوە[15]...

لێم ڕاوەستن.. لێم ڕاوەستن.. هەرچەند فرۆید بە ( وتن و نووسین )ی مەرەکەبی سەر کاغەز ئەمەی نەوتووە... بەڵام بە کردەوەو چەسپاندن وتی و کردی.

بەهەشت: ئای فرۆیدی فێڵباز.. سەیرکە چۆن خۆی وەکو بێباوەڕ (ملحد)ێك پیشان ئەداو ئەڵێ ( مێژووی بیروباوەڕی گرۆی مرۆڤایەتی ئەکرێ بە سێ قۆناغەوە، قۆناغی ئەفسانە، قۆناغی ئایین و خواپەرستی، قۆناغی زانیاری.. وە ئەڵێ بە هاتنی هەر قۆناغێك ئەم قۆناغانە ئەوی پێشووی کۆتایی دێت..)[16] چونکە ئیشی پێیەتی.

نەورەسی: بەهەشت گیان، من بڕوام بە هیچ دژایەتیەکی نێوان تیۆرە دانراوەکان ـ بەڕاست و ناڕاستیانەوە ـ نیە لەگەڵ ئایینددا و وا ئەزانم هەر تیۆرەی بۆ کارگوزاری و کارەکەری ئایینێك دانراوە، چونکە:

---

[15] – هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٣٠.

[16] – سەرەتای کتێبی ( شبهات حول الاسلام ) ل١١.

١. ئەو وتەیەی فرۆید، نە خۆی باوەڕی پێیەتی و نە کەس بڕوا بە فرۆید ئەکات.. ئەوە بۆ پرسیار لە فرۆید و فرۆیدبازەکان ناکرێت.. ئایا جوولەکە لە سەدەی بیستدا . لە سەدەی گەشتەکانی ئاسمانیدا . نەبوو کە یەکەمین دەوڵەتی جوولەکەیان دروست کرد..؟ ئایا لە سەدەی بیست . سەدەی زانیاری ـ دا نەبوو کە جوولەکە لە . کنیست . سەرەك کۆمار و وەزیر دائەنێن سەرەك کۆمارو وەزیران فنیش ئەکەن..

ئەگەر ئایین و هەستی ئایینی نەبێ چی هەیە لەم سەدەی بیستەمەدا . جوولەکەی ڕوسی و ئەمریکی و هیندی و یابانی و عێراقی و.. لە هەموو سەرانسەری زەویدا کۆبکاتەوە.

٢. هەرسێ بیروباوەڕو فەلسەفەو ڕێبازەکەی ئەمڕۆی سەر زەوی (مادییەت و میسالیەت و ئیسلام) هەرسێکیان بۆ کارگوزاری ئایین بەرپا بون.. (مادییەت) (ماتریالی) بۆ کارگوزاری جوولەکایەتی و زایۆنی لەناوجەرگەی بیروباوەڕی جوولەکایەتییەوە هەڵقولاوەو پاڵەوانان و ئەکتەرەکانی سەر شانۆکەی . کۆن و نوێ و ئێستا ـ ی یان جوولەکەیە یان بەندە جوولەکەیە.. (میسالیەت= ئایدیالی) بۆ کارگوزاری ئایینی (گاورێتی = یان = مەسیحی/ و سەلیبی (صلیبی)ی جیهانی

دانراوەو لە کاسەی بیرەوەری ئەوانەی هەڵگۆزراوە و پیاوانی میسالی . هەر هەموویان . یان گاورن یان پیاوی گاورن.
ئیسلامیش.. ئیسلامەو هیچی تر.. بۆیە ئیسلام نە مادییەو نە میسالی بۆیە ﴿ وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ﴾ البقرة ١٢٠ وە چونکە (مەسەلەکە) زۆر لە زۆرانبازی و شەڕە وشە گەورەترە.
بەهەشت گیان.

ئا بەم شێوەیە بۆت دەرکەوت کە فرۆید ملحدو بێ ئایین نەبووە.. بەڵکو پێشمەرگە و گیان فیدای ئایینی جوولەکە بووە..

بەهەشت: ئەمانە هەموو ڕاست و دروستن.. جوولەکایەتی فرۆید ئاشکرایەو بۆیە یەکەم کەسێ لە هەڵگرانی بیروباوەڕی مارکسیزم دەروازەی بۆ فرۆیدیزم خستە سەر پشت (ترۆتسکی) جوولەکە بوو[17].. جا ئێستا نۆرەی باسکردنی خاڵی سێهەمینەو حەز ئەکەم ڕەنگدانەوەی داروینزم لە بیروباوەڕی فرۆیدیزمدا بۆ باس بکەیت .

نەوڕەسی: بە چاوان (بەهەشت) گیان..

بەهەشت گیان.. کوفر بەگشتی و جوولەکە بەتایبەتی دەستێك بوو ژان ئەیگرت بە ئایینەکانی ترەوەو تۆڵە سەندنەوەی

---

[17] - المراة والاشتراكية، لينين وآخرون، ص١٨٤.

جوولەکەکان لە ئیسلام و مەسیحی، بەر لەدایك بونی داروێنیزم هەموو شتێك ئامادە کرا.

١. لەدایك بونی بیردۆزی . داروین ـ گەورەترین هەلی زێڕینی خستە دەست جوولەکەو دوژمنانی ڕەوشت .

کاتێ کە مرۆڤ ئاژەڵ بێ و لە نەژادێکی ئاژەڵی بێ.. بۆ ئەبێ ئەم بارەی لەسەر بار بکرێ.. بۆ ئەبێ هیچ جۆرە سنوورو یاساو (قیم)ێك بۆ (مەیموون)ی ئامۆزای و (کەری) پورزای و (سەگی) خاڵۆزای، دانەنرێت و ئەم مرۆڤە هەژارە (هەر بەوەی لەباتی چوار پێ لەسەر دوو پێ ئەڕوات) بە هەزاران کۆتی (قیم) و (ئایین) و (یاسا)و (کۆمەڵ)و.. هتد.. وەکو تەوقی عەزازیل و مۆتەکە بچێتە ملیەوە..؟؟

ئەم گەڕانەوەی (مرۆڤ)ی (خلیفەی) خوایە بۆ ئەو (ئاژەڵی)یە، زێڕێنترین هەوڵ و نەرمانی ترین زەوی خۆش کردو چاکترین کات و جێگای دروست کرد بۆ ڕواندنی بیروڕاکانی (مارکس و فرۆید و دورکایم..)[18] هتد..

بەڵێ (داروین)ی هەژار نەیوتووە، ئایین و ڕەوشت لە پەشیمانبونەوەی چەند زۆڵێکی (برسی بە دایکی خۆیان) دروست بووە، وەکو فرۆید ئەڵێ.. وە داروین نەیورت ئایین و

[18]– سەیری کتێبی ( داروین لە تەرازووی ژێریدا ) بکە.

(قیم) هیچ نرخێکیان نییە و هەموو ڕەواڵەتی کوێرەوەری ئابوورین و مێژووی دوورو درێژی ئادەمیزاد شەڕە پارووە وەکو ـ مارکس ئەڵێ.. و نەیووت وەکو ئینگلیزو دورکایم و لینین و ترۆتسکی بیلێ.. بەلام تەنیا ڕاڤەکردنی ئەمانەی وتوو، نە ویستوویەتی بیلێ.. بەلام تەنیا ڕاڤە کردنی چۆنێتی پەیدابونی ئادەمیزادن و گەڕانەوەی بۆ ئاژەڵێتی و توێژینەوەی مرۆڤ وەکو تۆپەڵە مادەیەکی بێ گیان و سڕینەوەی وشەی (گیان = ڕۆح) لە مرۆڤ، بەسە و (زۆریشی زیادە) بۆ جوولەکەو تەنینی داوەکانیان.

٢. نووسەری ماتریالی (هێکسلی) ئەڵێ (لەدوای هاتنی داروین) نابێ مرۆڤ بێجگە لە ئاژەڵ خۆی بەهیچ شتێکی تر بزانێ.[١٩]

٣. بە لاچوونی پاڵەوانی سەر شانۆی بە ئاژەڵکردنی مرۆڤ (داروین) پاڵەوانێکی تر هاتە سەر شانۆ کە ئەویش (فرۆید) بوو.. بەڵکو ( ڕەحمەت لە کفن دزی پێشوو) فرۆید[٢٠] ئەڵێ مرۆڤ تەنیا ئاژەڵە بەڵکو ئاژەڵێکی جنسییەو هەموو ژیانی جنسە).

---

[١٩]- الأنسان في العالم الحديث، گولیان هێکسلی، گۆڕینی بۆ عەرەبی، حسن خطاب، ص٣١-٣٧.

[٢٠]- الأنسان بين المادية والأسلام، ص ٢٤-٢٥.

٤. فرۆيد زۆر دڵبەندی داروين بووەو بە شانازييەوە ناوی ئەبات سەری قوتابيێتی بۆ دائەنەوێنێ و ئەڵێ[٢١] ( بەسەو مايەی شەرەفە بۆ داروين كە لە ( گۆڕستانی . ويستەمەنسەتردا نێژراوە ))[٢٢].

٥. لای فرۆيديزم مرۆڤ دوو ژيری هەيە.. ژيرييەكی تازەو كۆن.. ئەو ژيريە كۆنە ئەو ژيرييەيە كە لە باووباپيرە ئاژەڵييەكانيانەوە بۆيان جێماوە) جا فرۆيديزيم ئەڵێ ( ژيرييە تازەكە زوو ماندوو ئەبێ و ئەمە ژيريی كاتی ئاگاداری و كاركردن و زانستە.. بەڵام كاتێ خەواڵو ئەبن و وەنەوز زۆريان بۆ ئەهێنێ ژيری يەكەم دەوری نامێنێ و ژيريە كۆنە ئاژەڵيەكەيان ئەگەڕێتەوە[٢٣].

چاووت لێيە بەهەشت گيان فرۆيديزم ئەيەوێ داروێنيزم بكاتە كاڵای سايكۆلۆجيەكەی..

سلامە موسى ئەڵێ ( فعقلنا الكامن يجري على أساليب آبائنا المتوحشين)[٢٤].

٦. داروين خۆی لە ساڵی (١٨٧٢) كتێبێكی لەژێر ناونيشانی

---

[٢١] – موسى والتوحيد، ص ٩٥.

[٢٢] – (Westminster) گۆڕستانێكە لە (لەندەن) پاشاكان و پياوەگەورەكانی ئينگليزی تێدا ئەنێژرێن.

[٢٣] – أسرار النفس، ص٩–١٠.

[٢٤] – هەمان سەرچاوە، ص٩–١٠.

( دەربڕینی هەڵچوونەکان لای مرۆڤ و ئاژەڵ  بە چاپ گەیاند کە ئەم کتێبەی داروین بریتی بوو لە دانانی بەردی بناغەی فرۆیدیزم )[٢٥].

بەهەشت: ئۆی توخوا ئەگەر ئیتر باسی (داروین)م بۆ بکەیت تازە دوای لێدوانەکەی خۆتان (داروین لە تەرازووی ژیریدا) قسەی داروین لای من چ نرخێکی هەیە..؟

نەوڕەسی: مەبەستم ڕاست و ناڕاستی قسەی داروین نیە، ئەوە باسێك بوو مافی خۆی درایە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە بزانی کە داروینی و فرۆیدی و هتد.. زنجیرەی پیلانێك بون لە مرۆڤایەتی کران و بزانی تا چ ڕادەیەك فرۆید پابەندو دەسەمۆی داروێنیزم بووە.

بەهەشت: زۆر ڕاستە.. ئەڵێی هەموویان بووکەشوشەن بە دەزووی جوولەکە جموجوڵ ئەکەن.

نەوڕەسی: جا ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بڵێین فرۆید ئەڵێ چی و تا چ ڕادەیەك ڕاستە، باسی بکەین.

بەهەشت: ئای کاکە گیان.. خوا لە منت نەسێنێ و پاداشتت بداتەوە.

---

[٢٥] – اصول علم النفس وتطبيقاته، ص٢٤–٢٥.

نەوڕەسی: بەهەشت گیان فرۆید بلیمەت و هەڵکەوتوویەکی کاتی خۆی بووە بەڕاستی لێهاتوو و لێزان بووە.

بەهەشت: هەموو بۆ کارگوزاری ئایینەکەی: چونکە ئەو وەکو خۆی ئەڵێ (جوولەکەیە پێش ئەوەی هەر شتێکی تر هەیە) بەڵێ لەگەڵ جوولەکایەتییەکەیدا زۆر بلیمەت بووە.. بەسە بۆ فرۆید کە نووسەری کتێبی ( الأنسان بين المادية والاسلام ) ئەڵێ ( كنت في صغري شديد الأعجاب بفرويد إلى حد الفتنة ).

نەوڕەسی: ڕەحمەتی خوا لە مامۆستا (محمد) ئاخر سەرسامی کوێی و چی بووە..؟

بەهەرحاڵ.. ئێستا دێینە سەر ڕوانگەی فرۆیدیزم لەو ڕووانگەیەوە سەیری ئاین و ڕەوشت و خێزان و هتد.. ئەکەین.

بەهەشت: زۆر باشە فەرموو..

## ئایین لە ڕوانگەی فرۆیدییەوە :

نەوڕەسی: بەهەشت گیان پێش ئەوەی باسی ڕاکانی فرۆید و تێڕوانینی ئایین لە ڕووانگەی فرۆیدییەوەت بۆ بکەم، پێویستە بزانین هەموو باس کردنێکی فرۆیدو توێژینەوەی هێرشبەرانەی فرۆید بۆ سەر ئایین و لەبارەی ئایینەوە، مەبەستی ئایینی مەسیحیە بە پلەی یەکەم و هێرشهێنانە بۆ ئیسلام بە لا تیر و دواجار هەموو ئایینێك . جگە لە ئایینی جوولەکە.. نمایان و دیارییە فرۆید مەبەستی (سەرو حەج بێسەری شەریك)ە وەکو جاران و موشێن (کەلایەن)ی منالی خۆمان.

فرۆید لەبارەی چۆنێتی پەیدابونی ئایین و یەکەمین ڕواڵەتی پەرستنەوە ئەڵێ[٢٦]:

ئایین لە ئەنجامی تاودانێکی ناپەسەندەوە دروست بووە.. تاودانەکەیش ئەوەیە..

( لە تاریکایی مێژووی مرۆڤایەتیداو لە خێزانێك لە کوڕەکان دڵیان چوو لە دایکیان و باوکیشیان نەیئەهێشت دایکیان بۆ هەموویان بێ ( واتە ژنی باوك و کوڕەکانیش بێ ) و داگیری

---

[٢٦]- الطفل بين الوراثة والتربية - ج/١، ص٣٢٤.

کردبوو تەنیا بۆ خۆی[٢٧] چەند ئەمسەرو ئەوسەریان کرد لەگەڵ باوکیان بۆ هاوبەشی سوودی نەبوو )...

دواجار بڕیاریاندا باوکیان بکوژن، بەڵێ بڕیارەکە جێبەجێ کراو باوکە کوژراو دایکە وەکو هەموو پیتاك و میراتەکەی تری بەجێما بۆ منداڵەکان.. بەڵام ئەو کێشەیەی باوکیان لەسەر کوشت و وایان ئەزانی بە کوشتنی باوکیان کێشەکە چارەسەر ئەکرێ و نامێنێ، وا دەرنەچوو کێشەکە گەورەتر بوو، چونکە کوڕەکان گیریان خوارد بە دەستی دایکیانەوە.. بۆ کامیان و ژنی کامیان بێ..؟ هەمان کێشەی کاتی باوکیان هاتەوە پێش، یان ئەبێ بەربینە یەکتری کوشتن و یەکتری بڕینەوەو دواجار کێ دەرچوو بۆ ئەوە بێ.. یان ئەبێ واز لە دایکیان بهێنن.. لەبەرئەوە هەموویان لە کوشتنی باوکیان پەشیمان بونەوەو وازیان لە دایکیان هێنا.. کوشتنی باوکیان بووە خەفەتێکی گەورە لەسەر دڵیان.. هەستیان بە تاوانبارییەکی گەورە ئەکرد بەرامبەر باوکە بێتاوان و کوژراوەکەیان.. ئەم هەستە دڵ و دەروونی هەموویانی داگیر کرد.. خۆشەویستیەکی بێپایانی باوکیانی لە دڵیان چاند بە شێوەیەك هەر ئاژەڵێك، هەر گاو

---

[٢٧] – الأنسان بين المادية والاسلام، ص٤٢ لە کتێبی (Totam and taboo)ی فرۆید ص١٤٥-١٥٤.

گۆلکێك باوکیان خۆشی ئەویست لە ژیانیدا ئەمانیش زیاتر لە ئەندازە خۆشیان ئەویست و تەنانەت سەریان نەئەبڕی و نەیان ئەخوارد.. بەمیشەوە نەوەستان بەڵکو ئەو ئاژەڵە خۆشەویستەی باوکیان ئەپەرست.. بەم شێوەیە یەکەم ڕواڵەتی پەرستن و بەندایەتی دروست بوو، کەواتە بناغەی ئایین و پەرستن لەم کارە ناپەسەندە ناپاکەوە دروست بووەو هەموو ئایینەکان لەم سەرچاوەوە هەڵقوڵاوەو ڕوواوەو دواجار پەل و پۆی هاویشتووە..

وە فرۆید لای وایە ( ئێستایش هەموو هەستێکی ئایینی و ڕەوشت بەرزی ئەگەڕێتەوە بۆ سەرکوت کردن و خەفەکردنی پاڵەپەستی جنسی )[٢٨].

فرۆید بەوە وازناهێنێ کە (ئایین) شتێکی تارمایی بێ بناغەو دوور لە ڕاستی و وەهمی (illusion) بێ بەڵکو ئەڵێ بونی ئایین مەترسییە (Danger) و خەڵکی ئەبەستێتەوە لە بەکارهێنانی ژیرییان و ڕەخنەگرتن لە کردەوەی ڕۆژانەی خۆیان تا دواجار بیرکردنەوەیان ئەمرێ.. وە فرۆید لای وایە ئایین مەترسی زۆرە لەسەر ڕەوشت و هەڵسوکەوتی خەڵکی و مەترسی هەیە بۆ خۆشەویستی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ و ئەگەر مرۆڤ

---

[٢٨]- هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

بتوانێ لە بیرەوەری و داڵغەی ئایین ڕزگاری ببێ پشت بەو خوا تاشراوە نەبەستێ و پشتە سووری خۆی و ژیری خۆی بێ، پێ ئەگات.. وە پێویستە مرۆڤ بزانێ چۆن ڕووبەڕووی (واقع) بوەستێ و چاوەڕێی هیچ هێزێکی میتافیزیکی نەبێ..)[29] وە فرۆید لای وایە ( هەموو ڕواڵەتێکی ئایین ئەگەڕێتەوە بۆ کاتی منداڵییان.. کاتێ منداڵ دێتە ئەم جیهانەو خۆی لە بەرامبەر ئەم جیهانە فراوانە ئەبینێ و هیچ دەسەڵاتێکی ژیان و خۆسازدانی نییەو تاقانە پشتیوان باوك و دایکێتی ئەوسا لە گۆمی ژیان ترسی ئەشکێت، هەروەها کە گەورە بوو دایك و باوکی نەما یان لە باوك و دایکی بەلەسە بوو پشتەسووری خوایەکی خەیاڵی دروستکراو ئەبێ هەرچی ترسێکی سروشت ڕووی تێ کرد ئەیداتە دەست ئەو خوایەو ترسی خۆی بەو خوایەو بڕوای بەو خوایە ئەنیشێتەوە..)[30].

ئەمەیە ئایین لە ڕوانگەی فرۆیدییەوە، ئەوە ڕای بەرامبەر ئایین.

بەهەشت: بەڵێ ئەوەیە ڕای فرۆید و ڕاڤەی فرۆید بۆ ئایین، ئەگەر زیانی بۆ جوولەکە نەبوو.. بەڵام ئەگەر باسی جوولەکە کرا ئەوە ئەودیوی قەوانەکە لێ ئەداتەوە.

---

[29]- الأنثى هي الأصل، ص٢١٨-٢١٩.

[30]- الطفل بين الوراثة والتربية، ج/١، ص٣٢٢-٣٢٣.

نەوڕەسی: ئای.. بەهەشت گیان لەبیرتە کاتێ (ماکس گراف) وتی بە فرۆید، با بە منالەکانمان بلێین واز لە ئاینی جوولەکە بێنن ئاگات لێ بوو چۆن فرۆید لێی تووڕە بوو وتی (ئەگەر وازیان لە ئایینی جوولەکە پێبهێنی لە وزەیەك بێبەرییان ئەکەیت کە بەهیچ شتێك بار بوو ناکرێتەوە.. وە ئایا لەبیرتە کە فرۆید وتی (پێش ئەوەی خەڵکی ئەڵمان یان نەمسا بم جوولەکەم..) ئای بۆ ئەو موسڵمانەی دەرس لە فرۆید وەربگرێ و بڵێ (پێش ئەوەی هەرچی بم و خەڵکی هەرکوێ بم موسڵمانم).

بەهەشت: لەبیرمە.. چۆن لەبیرم نییە.. ئەی نازانم تۆ ڕات بەرامبەر بەو ڕاڤە کردن و شیتەڵ کردنەی فرۆید چییە..؟!

نەوڕەسی: بۆ ئەوەی ڕاستی و ناڕاستی ئەم ڕاڤەکردنەی فرۆیدت لەبارەی ئایینەوە بۆ باس بکەم ئەڵێم:

١. با پرسیار لە فرۆید و هەموو (فرۆیدبازەکان) بکەین بڵێن (ئایا بۆ چەسپاندن و سەپاندنی ئەم چیرۆکەی کە کراوەتە ڕووداوێکی مێژوویی و بنچینەی تیۆرێکی (زانیاری) لەسەر دانراوە . ئایا یەك تاقە بەڵگەی مێژووییان بەدەستەوە هەیە..؟ نەخێر.. زۆر چاکیش نەخێر.. نیو بەڵگە ؟ نیە.. چارەکە بەڵگەیەك..؟ نیە.. تارمایی بەڵگەیەك..؟ نیە.. ئەی لە کام بن باخەڵی جوولەکە دەریان هێناوە ؟.

٢. دیسان . بەهەشت گیان . با پرسیار لە فرۆید (خۆی) بکەین و بزانین، ئایا خۆی کە خێزانی بووەو شەش منالی بووە... هیچ لە منالەکانی خۆی تەماعی کردۆتە دایکیان و حەزی لێبکات و فرۆید بکوژێت..؟ یان لەگەڵیان ڕێکەوتبوو..؟!

٣. دیسان پرسیار لە فرۆید و فرۆیدیزم بکەو بڵێ (بۆچی ئەو کوڕە لاوە هەرزەکارانە حەز لەو دایکە پیرەژنە چرچۆڵە بکەن و بگاتە پلەی باوك کوشتن.. لەگەڵ ئەوەدا هەزاران کیژی شەنگ و شۆخی لاو هەبوو ئەیان توانی لەگەڵی ڕابوێرن بەتایبەتی کە فرۆید خۆی ئەڵێ ئەو کاتە نە ئایین و نە هیچ جۆرە ڕواڵەتێکی ڕەوشت نەبوو تا کوڕ و کچ لەیەکتری جیابکاتەوە..؟

٤. کوڕەکان پێش ئەوەی باوکیان بکوژن.. بۆچی بیریان لەوە نەکردەوە کە دوای مردنی باوکیان، دایکیان بێ و چۆن نەیان ئەزانی کێشەکە بە کوشتنی باوکیان تەواو نابێ..؟ یان فرۆید خۆڵی کردبووە چاویان..؟

٥. بەهەشت گیان لەبیرتە باسی ئەو پەتەم بۆ کردیت کە داروین و فرۆید ئەبەسێ بە یەکەوەو پێم وتی ئەمانە کرێکارو پاچ وەشێنی ڕەوشت ڕوخاندنن..؟

بەهەشت: بەڵێ، ئەزانم هەردووکیان قوتابی یەك قوتابخانەی بەرووددوان..

نەوڕەسی: داروین ئەڵێ ( لە ڕەشە وڵاخدا، کەڵەگا تازە پێگەیشتووە بەهێزەکان ئەیانەوێ بپەڕێن لە مانگا (دایکانەکەیان)، کەڵەگا (باوکانە) پیرەکەیان قەدەغەیان ئەکات و ناهێڵێ کەڵیان لێ بگرێت.. دواجار ئەبێتە جەنگ لەنێوان کەڵەگا گەنجەکان و کەڵەگا پیرەکەداو گا پیرە ئەکوژرێ بەڵام پاش کوژرانی گا پیرەکەیش ئەمانیش لەناو خۆیاندا بەر ئەبنە یەکتری و یەکتری ئەکوژن.. هەتا دواجار کامیان لە هەموویان بەهێزتر بێ ئەمێنێتەوەو دایکیان بەمیراتی بۆ بەجێ ئەمێنێ..)[٣١].

ئیتر لە ژێر نەخشەی ئەم وتەی داروینەدا فرۆید هەڵساو ئەم چیرۆکەی تاشیی و لەسەر ڕێسای ( قیاسی کەشك لە مەشك ) کردییە کاڵای باڵای ئەم مرۆڤەی خەلیفەی خوایە.

٦. ئەگەر لە ڕوانگەی ئیسلامەوە سەیری دیاردەی کوشتار و یەکەمین مرۆڤی کوژراو بکەین، زۆر جیاوازە لەگەڵ چیرۆکەکەی فرۆیددا.

ئەویش بریتی بوو لەوەی (قابل)ی کوڕی ئادەم پێغەمبەر (هابیل)ی برای کوشت و لەبەرئەوەیش بوو کە هەر یەکەیان خێرێکی کردو خوا لە (هابیل)ی وەرگرت و لەوی وەرنەگرت[٣٢] و

---

[٣١]- معركة التقاليد، ص ٢٩.

[٣٢]- في ظلال القرآن، ج٢، ص٨٧٥.

لەبەر دڵ پیسی و زاڵ بونی گیانی تۆڵەسەندن بەسەر دڵە کرمۆکەکەیدا برا چاکە دڵ نەرمەکەی خۆی کوشت..[٣٣].

.. لەگەڵ ئەوەیشدا کە (قابیل) زۆر پەشیمان بووەوە لە کردەوە ناشرینەکەی و ( فاصبح من النادمین )[٣٤] بەلام نە ( تۆتمی بۆ دروست کردوو، نە بووە هۆی پەرستنی ئەو شتانەی براکەی خۆشی ئەویست[٣٥].

بەهەشت: کاکە گیان ئەگەر نەختێك لەم چیرۆکە قورئانی و بەسەرهاتەی کوشتنی (هابیل) بکۆڵینەوەو لە دەقی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ لادەین و گوێ بگرین بۆ ڕاڤە کەرانی قورئان (ئەوانیش ئەڵێن هۆی ڕق هەستان و خەشمی قابیل لە هابیلی برای هەر جنسەو پاڵەپەستۆ سێکس پالی نا بە قابیلەوە براکەی خۆی بکوژێ[٣٦].. قابیل ئەیویست خوشکەکەی نەدا بە هابیل و خۆی مارەی بکات... ئەی وانەبوو..؟

---

[٣٣]- سەیری نامیلکەی ( ئادەم پێغەمبەر ) ل ٥٨-٧١ وە سەیری تەفیسری نامی بەرگی سێیەم ل٣٥-٣٦ بکە.

[٣٤]- سورة المائدة، آیة: ٣١.

[٣٥]- مجلة - آفاق عربیة، العدد، الأول السنة السابعة، ایلول، ٩٨١، ص٨٧.

[٣٦]- سەرەڕای ( ئادەم پێغەمبەر (ل ٦٧-٦٨)و (تەفسیری نامی ل ٣٧ ) سەیری ( مع الأنبیاء في القرآن الکریم ) ل٥٣-٥٤ بکە.

نەوڕەسی: ناتوانم نە بڵێم وابوو نە بڵێم وانەبوو... چونکە:

أ. ئەو چیرۆکە لە قورئاندا بەو شێوەیە نییەو قورئان باسی ژن و ژنخوازی لەو مەسەلەدا نەکردووەو تەنانەت ناوی ( قابیل و هابیل )یش نابات و تاقانە سەرچاوەی هەموو (مفسرین) تەنیا سەرچاوەی ئیسرائیلیەکانە.. کە ئەوانیش سەربەسەریان جێگای گومانەو موسڵمان پشتەسووری نابێ[27].

ب. ئەو چیرۆکە بەو شێوەیە کە ڕاڤەکەرانی قورئانی پیرۆز ئەیگێڕنەوە لە تەورات و (سیفری تکوین)و بەشی چوارەمدا هەیە[28] و ئەمانیش دەقاو دەق هێناویانەو دایانناوە!.

ج. وەکو لە پێشەوە وتم پاش کوشتنی (هابیل) و پەشیمانیەکی زۆری (قابیل) ئەو پەشیمانییە نەبووە هۆی پەیدابونی ئایین و هیچ جۆرە ڕواڵەتێکی پەرستن و هیچ دیاردەیەکی بەپیرۆز زانین پەیدا نەبوو.

د. کوشتنی (هابیل) ئەگەر لەسەر ژنیش بوو بێ و پاڵەپەستۆی سێکس بووبێ زۆر ئاسایی بووەو نابێتە پشتیوانی وتەکەی فرۆید و چ کوشتنی (هابیل) و چ کوشتنی (باوک)ەکەی فرۆید،

---

[27]- التفسير الكاشف، ج٣، ص٤٥-٤٦.

[28]- تفسير المنار، ج٦، ص٣٥٠-٣٥١.

ئەمانە دیاریەکی کۆمەلایەتین و ڕەنگە هەموو ڕۆژێك و لە هەر کۆمەڵێکدا ڕووبدات و دووپات ببێتەوە[39].

٧. هەست کردن بە گوناه و تاوان شتێکی پەیدا بوو (کسبی)یەو بنەمایی (وراثی) نیەو ئیتر ئەو هەستەی لە دڵی کوڕەکاندا بۆ کوشتنی باوکەکە پەیدابوو چۆن گوێزرایەوە بۆ ڕۆڵەو نەوەی داهاتوویان؟ چۆن پاش هەزاران ساڵ ئەم هەستە هەر ئەمێنێ و ئەم هەموو نەوەو وەچەیە هەست بە تاوان ئەکەن[40]..؟

٨. تەرێز کردن لە دایك شتێکی سروشتییە هیچ مرۆڤێکی ئاسایی نیە دڵی بچێتە سەر دایکی و چەندە زۆڵیش بێ..

بەهەشت گیان لەکاتی خەلیفەی دووەم (عمری کوڕی خطاب) خوا لێی ڕازی بێت، لاوێك هانای لێ بەرزبوویەوە و هاواری ئەکرد، خەڵکینە لەڕای خوا فریام کەون لەدەست دایکم.. خوا هاوار لەدەست دایکم، عومەری پێشەوا گەیشت بە کوڕەکەو بەدەم هاوارکردنەوە ڕووبەڕووی خەلیفە هات و خەلیفە فەرمووی، کوڕە چیت ئەوێ لە دایکت..؟ کوڕە وتی ئەی سەرۆکی موسوڵمانان ئەوە دایکمە، نۆ مانگ لە سکیدا بووم و دوو ساڵی ڕەبەق شیری داومەتێ.. بەڵام کاتێ گەورە بووم خێرو

---

[39] - مجلة آفاق العربية العدد (١) السنة السابعة أيول (٩٨١) ض ٨٧.

[40] - هەمان سەرچاوە ل ٨٩.

شەرم لە یەکتری جیا ئەکردەوە ڕاست و چەپی خۆمم ناسی، دەری کردم و یەخەی خۆی لێ هەڵتەکاندم وەکو نەمناسێت...
خەلیفە فەرمووی.. دایکت لەکوێیە.. وتی لە فلانە شوێنە..
خەلیفە فەرمانی دا بڕۆن لەو جێگایە ئەو ئافرەتە و کێ ئەیەوێ لەگەڵی بێت با بێت.. بەڵێ ژنە لە تەك چوار برای و چل کەسی شایەتی سوێن خۆرو سوور لەسەر شایەتی، هاتن و لای خەلیفە هەر چل شایەتەکە شایەتییان دا کە ئەم ئافرەتە ئەم کوڕە ناناسێ و ئەم کوڕە درۆ ئەکات ئەم ئافرەتە کچەو هێشتا شووی نەکردووە ئێمە زۆر بە باشی ئەیناسین، (قورەیشی)یەو ئاگامان لە هەموو هەڵسوکەوتێکی هەیەو کچە بە مۆری کچێتییەوە ماوە.. خەلیفە عومەر (خوای لێ ڕازی بێت ) ڕووی کردە کوڕەکەو فەرمووی.. ڕۆڵە تۆ چی ئەڵێی.. کوڕە وتی... قوربان ئەی گەورەی موسوڵمانان بەخوا سوێن ئەخۆم کە ئەو ئافرەتە دایکمەو نۆ مانگ لە سکیدا بووم و دوو ساڵی ڕەبەق شیری داومەتێ.. بەڵام کاتێ گەورە بووم و خێرو شەڕم لە یەکتری جیاکردەوەو ڕاست و چەپی خۆمم ناسی، دەری کردم و یەخەی خۆی لێهەڵتەکاندم وەکو هەر نەمناسێت.. ئینجا عومەری دادپەروەر ڕووی کردە ئافرەتەکەو فەرمووی: تۆ ڕات چۆنە بەرامبەر بەو وتانەی ئەم کوڕە.. ئافرەتەکە وتی: ئەی گەورەی

موسوڵمانان سوێن بێ بەو کەسەی خۆی بە نوری خوایەتی پێچاوەتەوەو کەس نایبینێ و سوێن بێ بە ڕاستی پێغەمبەرێتی محمد ﷺ ئەم کوڕە ناناسم و هەر نازانم کوێنەری و لە کام هۆزو کۆزە.. ئەم کوڕە ئەیەوێ لەناو خێڵ و نەتەوەکەم سووکم بکات.. من کچم و قوڕەیشیم و تا ئێستا شووم نەکردووەو (کچێتی)م ماوە.. خەلیفە فەرمووی بە ژنەکە شایەتت هەیە؟

وتی: بەڵێ، ئەوانە.. چل شایەت یەکە یەکە هاتنە پێشەوەو بە خەلیفەیان وت کە ئەم درۆ ئەکات و ئەیەوێ شەرەفی ئەم ئافرەتە چڵکن بکات و نەنگی بەسەردا بێنێ و ئەمە کچە قوڕەیشیە خوا چۆن بە کچ دروستی کردووە وەکو خۆی ماوەتەوە.. خەلیفە فەرمووی.. کوڕەکە بەرن بۆ بەندیخانە هەتا لێکۆڵینەوەم لەگەڵ ئەم شایەتانە تەواو ئەکەم، جا ئەگەر قسەی کوڕەکە بەدرۆ کەوت وا چەڵدە و شەلاقی درۆزن (مفتری)و بوختان کەری لێ ئەدەم.. بەڵێ کوڕەکەیان برد بەرەو بەندیخانە لە ڕێگا تووشی خەلیفە (عەلی کوڕی ئەبو طالب) (خوای لێ ڕازی بێت ) بون کوڕەکە کە حەزرەتی (علی) بینی بانگی کرد، ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا، من کوڕێکی ستەملێکراوم . بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ حەزرەتی علی گێڕایەوەو دواجار وتی ئەوا حەزرەتی عومەریش فەرمانی داوە بەندم بکەن.. (علی) فەرمووی بە پاسەوانەکان.. بیبەنەوە بۆ

لای عومەر.. کاتێ کوڕەکەیان بردەوە ، عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی.. ئەوە من نەمووت بیبەن بۆ بەندیخانە بۆچی نەتان بردووە..؟

وتیان: ئەی سەرکردەی موسوڵمانان، لە ڕێگا ڕووبەڕووی (علی) بووینەوە ئەویش فەرمووی مەیبەن بۆ بەندیخانەو بیبەنەوە بۆ لای عومەر.. لەم قسانەدا بون، حەزرەتی علی هات و پاش نەختێك داوای دایکی کوڕەکەی کردو دایکەکەیان هێنا..

حەزرەتی عەلی فەرمووی: ئەم کوڕە چیتە ؟

ئافرەتەکە وتی: درۆ ئەکات نایناسم و چۆن لای حەزرەتی عومەر پاکانەی کرد بە هەمان شێوە دووبارەی کردەوە... حەزرەتی عەلی مۆڵەتی لە خەلیفە خواست و فەرمووی ئەی گەورەی موسوڵمانان مۆڵەتم ئەدەی ئەم کێشەیە چارەسەر بکەم.. عومەر فەرمووی.. (سبحان الله) ئەوە ئەڵێی چی! چەند جار گوێم لە پێغەمبەری خوا بووە فەرموویەتی.. زاناتری هەمووتان عەلی کوڕی ئەبو طالبە... فەرموو.. ئەمجا حەزرەتی عەلی ڕووی کردە ژنەکەو فەرمووی: شایەتت هەیە ؟...

وتی.. بەڵێ چل شایەت بە سوێن خواردن، هەمان شایەتیەکەی لای حەزرەتی عومەریان دووپات کردەوە.. فەرمووی بە ئافرەتەکە: ئایا کاربەدەست (والی)ت هەیە.. وتی: بەڵێ، ئەو

چوار زەلامە برامن.. حەزرەتی عەلی ڕووی کردە براکانی فەرمووی: ئایا بۆم هەیە چی بکەم لەم مەسەلەداو ئێوە سەرپێچیتان نیە...؟

وتیان: نەخێر قوربان تۆ چی بفەرمووی لەسەر سەرە چ لەبارەی خۆمانەوەو چ لەبارەی خوشکەکەمانەوە.. حەزرەتی عەلی فەرمووی ئەوا من ئەو ئافرەتەم مارە بڕی لەو کوڕە لەسەر چوار سەد درهەم (درەم).. ئادەی (قەنبەر)[41] بڕۆ ئەو چوار سەد درهەمە بێنە.. قەنبەر ڕۆیشت و چوار سەد درهەمەکەی هێناو حەزرەتی عەلی فەرمووی بە کوڕەکە.. ها بگرە ئەو پارەی مارەیی ژنەکەتە بیدە دەستی و هەڵسە پەلی ژنی خۆت بگرەو هەتا نەبی بە زاوا نەیەیتەوە.. کوڕە هەڵساو پارەکەی خستە کۆشی ئافرەتەکەو پەلی گرت و وتی هەڵسە.. لە پڕ ژنەکە قیژانی و وتی.. ئاگر.. ئاگر ئەی ئامۆزاکەی محمد، ئەتەوێ مارەم بکەی لە کوڕەکەی خۆم.. والله ئەوە کوڕمە.. براکانم.. برا.. بەمناڵی و بەزۆر بەشوویان دام بە پیاوێك، پیاوێکی بێگانەی نەناسراو ئەم کوڕەم بوو.. کاتێ کوڕەکەم گەورە بوو (باوکیشی سەرنگوم بوو) زۆریان لێ کردم کە لەخۆم بێبەری بکەم و دەری بکەم..

---

[41]- قەنبەر: وەرزێرو پیاوی حەزرەتی عەلی بوو.

ئەگینا والله ئەوە کوڕمەو دڵم کوڵ هەڵئەدا بۆ کوڕەکەم و قازانگێکەو چەپۆکان ئەکات.. هتد..

بەگریان دەستی کردە ملی کوڕەکەی و ڕۆیشتن..[٤٢] ئەم ڕووداوەو کورتە چیرۆکە ئەوەمان پیشان ئەدا کە تەریزو نەفرین کردن و تێکەڵاوی جنسی لەگەڵ دایکیدا شتێکی سروشتی مرۆڤایەتییە.. بڕوانە چۆن ئەو ئافرەتە چل شایەتی سوێنخۆری سوور لەسەر شایەتی ئەیانویست دایکێتی ئەو ئافرەتە بشارنەوە.. بەڵام کاتێ هاتە سەر مارەبڕینی دایك لە کوڕەکەی خۆی، سەیرکە چۆن ویژدانە سروشتیەکەی دایکێتی بانگەوازی لێهەڵساو پەردەی لەسەر هەموو کەین و بەین و پیلانێك هەڵماڵی.

ئەمە بۆ ناڕاستی و پڕو پوچی ئەو چیرۆکە دەست هەڵبەستەی فرۆید، تا بە باشی بۆت دەربکەوێ کە وەکو هیچ بەڵگەیەکی مێژوویان بەدەستەوە نییە.. هەروەها سروشتی مرۆڤی ئاسایی و مرۆڤایەتی بەگشتی بەدرۆی ئەخاتەوە..

بەهەشت: ئەی لەڕووی ئاینیەوە ڕات چۆنە..؟

نەوڕەسی: بەهەشت گیان.. ئەگەری سەیری چیرۆکەکەی فرۆید بکەین و بە چاوی لێکۆڵینەوە لێی وردبینەوە سەیری ئەکەین ( بێ ئەوەی فرۆید خۆی بەخۆی بزانێ ) ئەو پایانەی کە زانایانی

---

[٤٢]- الطفل بين الوراثة والتربية، ص٣٥١-٣٥٢ بە دەستکارییەوە.

ئایینی لەژێر خانووی ئاییندا دایئەنێن و ئەڵێن: ئەو هەستانە لە یەکەمین ڕۆژی پەیدابونی مرۆڤدا هەیە.. فرۆید لە چیرۆکەکەیدا چەسپاندوویەتی و لە توێ توێی شیتەڵکردنی بەسەرهاتەکەدا بە ئاشکرا دیارە.. ئەوانیش:

أـ هەست کردنی مرۆڤ بە پەشیمانی لەدوای کردنێکی هەر کارێکی ناپەسەند.

ب ـ بونی (حەرام) و قەدەغەکاری هەر لە یەکەمین خێزانی تاریکایی مێژووەوە.

ج ـ هەست کردن بە بەرژەوەندی گشتی و پاراستنی ئەو بەرژەوەندییە (پاش کوشتنی باوکیان ئەوە بوو بەر نەبونە یەکتری کوشتن).

د ـ هەر لە یەکەمین خێزانی تاریکایی مێژوودا مرۆڤ توانیویێتی چڵێسی نەوس و پاڵە پەستۆی شەهوەتی خۆی جڵەوگیری بکات و بەسەریدا زاڵ ببێ (حەزەکەی دایکیان خەفە کرد).

هـ ـ هەست کردن بە (ویژدانی ڕەوشتی = الوجدان الأخلاقي) پاڵەپەستۆی کۆمەڵ نیە بەسەر مرۆڤەوە وەکو فرۆید وا ئەزانێ.. بەڵکو هەستێکی دەروونی سروشتییە لە مرۆڤەکە خۆیدا، ئەمانە ئەو کۆڵەکانەن بونەتە پایەیەکی بەهێزو هەستی ئایینی لەسەر وەستاوە . ئەمە یەکەم .

٢. ئەوەندە فرۆید ئایینی جوولەکەی لا ڕاستە تەنانەت لای وایە (کە ئایینی ئیسلامیش کورت کردنەوەو دووپات کردنەوەی ئایینی جوولەکەیە..[٤٣] و ( لە پێشا محمد(ﷺ)یش جوولەکەی بۆ خۆی و گەلەکەی هەڵبژارد بەڵام گەشەکردنی ئایینە تازەکەی زۆری پێ نەچوو، وەستا..[٤٤].. بەهەشت گیان ئاگات لەو ڕەگەزپەرستییە ئاشکرایەیەو ئاگات لەو جیاوازییە گەورەی نێوان هەردوو ئایینەکەیە، لە هەموو ڕووەکانی هەردوو ئایینەکەوە .

بەهەشت: زۆر چاك ئاگادارم.. ئەی کاکە گیان تۆ ئاگاداری کە چۆن نووسەری مارکسی (جۆرج ترابیشی) گۆڕەری کتێبەکەی فرۆید بۆ عەرەبی . لە داوێنی هەمان لاپەڕەدا- چۆن بۆ فرۆید ئەپارێتەوەو وشکەڕنی بۆ ئەکات کە گوایا فرۆید فەقیرە! ئاگادارییەکی قووڵی نییە لە فینۆمیۆلۆجیای ئایینەکاندا، بۆیە بەراورد کردنەکەی لەنگ و نابەجێ و ڕەگەزپەرستانەیە .

نەوڕەسی: بەراوردکردنی وتەکەی داروین (یەکتری کوشتنی کەڵەگاکان) و وتەکەی فرۆید (کوشتنی باوکەکە).. زۆر دوورن لە یەکەوە و ناکرێتە یاسا بۆ مرۆڤ.. چونکە، ئاژەڵ لە هیچ

[٤٣]– موسى والتوحيد، ص١٢٩.

[٤٤]– هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

کردەوەیەکیدا پەشیمان نابێتەوە هەستی ڕاست کردنەوەی کردەوە چەوتەکانی نیە.. بەلام ـ وەکو فرۆید ئەڵێ ـ ئەوە بوو کوڕەکان پاش کوشتنی باوکیان ئیتر وازیان لە یەکتری هێناو پەشیمان بونەوە لە کردەوەکەیان.. کەواتە لە مرۆڤدا هەستێك هەیەو هەموو کردەوەیەك هەڵئەسەنگێنێ و نرخێکی تایبەتی ئەداتێ لە بازاڕی ڕەوشتدا.. ڕەنگە جاری وا هەبێ چەپە دووکەڵی غەریزە بەری ئەو هەستە بگرێ و دەستێك بوەشێنێ بەلام ئەمە نەبونی و نەمانی ئەو هەستە ناگەیەنێ، چونکە ئەو هەستە بەشێکە لە مرۆڤ و لێی جیا نابێتەوە[٤٥]..

ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی ترەوە.. سەیر ئەکەین لە کوشتنی کەڵەگاکان ـ ی داروین ـ هیچ جۆرە قەدەغەگەری و (حەرام) کردنێك پەیدا نەبوو، بەلام ـ بە خەیاڵی فرۆید ـ پاش کوشتنی باوکەکەی فرۆیدـ پەشیمانی و قەدەغەگەری و حەرام کردن و بەپیرۆز زانین دروست بوو، ئیتر هەر پاڵەپەستۆیەك هەبێ لە پشتی ئەم هەستی حەرام کردنەوە، دیارە هەڵوێست و کردەوەیەکی مرۆڤایەتی ڕووتەو دوورە لە هەموو خودخدەیەکی ئاژەڵی.. ئەم توانینی (قەدەغە کردن و حەرام کردنە)یان وەکو فرۆید خۆی ئەڵێ (سەرکوت کردنی ئارەزوو خەفە کردن)

---

[٤٥] ـ معركة التقاليد، ص٧٣-٧٤.

دەسەلاتێکە تەنیا مرۆڤ (هەر مرۆڤ بە تەنیا) هەیەتی و هیچ گیانداریکی تر نیەتی... کە ئەمیش دیارترین بەلگەی جیاوازی نێوان مرۆڤ و گیاندارەکانی ترە.. بەهەشت گیان.. کاتێ ئێمە ئەلێین (مرۆڤ ئاژەل نییە) مەبەستمان ئەوە نییە کە هیچ خوویەکی ئاژەلی لە مرۆڤدا نییە.. بەلێ لایەنی ئاژەلی لە مرۆڤدا هەیە بەلام لایەنی گیانیشی هەیە[٤٦].

بەهەشت: کاکە گیان تۆ ڕات چۆنە لەوەی کە (فرۆید) ئەلێ: ( لە ئەنجامی ترسانی مرۆڤ لە دیاردەکانی سروشتی و دەسەوسانی شیتەل کردنەوەی ئەو دیاردانە، ئایینی خۆی دروست کرد، بۆ ئەوەی ئەو ترسەی پێ بشکێنێ.. و هتد..) کە ئەمیش هەندێ کەسی تری جگە لە فرۆید وا ئەلێن..؟ جا تۆ چی ئەفەرمووی..؟؟

نەوڕەسی: بەهەشت گیان من پرسیار لە تۆ ئەکەمەوە ئەلێم.. وا گریمان مرۆڤی کۆنی دوور لە زانیاری و دوور لە تەلیسکۆب و میکرۆسکۆب و ڕۆکێت و سیوز و ئۆپۆللۆ و مەکۆك... هتد.. حەقی بووە بترسێ بەهۆی هەورە بروسکە و بوومەلەرزەو لافاو و بورکانی.. هتد.. نەزانیوە، بەلام تۆبی و خوا بەهەشت گیان ئایا:

* (ئەنشتاین) لە هەورە گرمە ترساوە وا باوەڕدار بووە..؟

---

[٤٦]- هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

* (برگسۆن) لە بورکان ترساوە وا باوەڕدار بووە...؟

* (پاستۆر) لە شەپۆلی دەریا یان لە بوومەلەرزە ترساوە وا باوەڕدار بووە..؟

* (ئەلەکسیس کاریل) و (دانتی) و (عەمانۆئیل) و (باسکال) و (برنادشۆ) و (تۆلیستۆی) و هەزاران و هەزارانی تر لە پاڵەوانانی زانست و زانیاری و دروستکەرو داهێنەری هەزاران شتومەکی کارگوزاری مرۆڤ دروستکەری شارستانێتی سەدەی بیست کە خاوەنی باوەڕبون بە بونی خواو ستایشیان کردووە.. ئایا لەچی ترساون و لەکام دیاردەی سروشت سڵیان کردۆتەوە..؟

* ئایا ئەو زانا هەڵگرانەی خەڵاتی (نۆبڵ) هۆی دیاردەکانی سروشتیان نەزانیوەو زیرەیان کردووەو لە ترسیان دەستیان داوەتە پەنابردن بۆ خوا..؟

**بەهەشت:** دووا پرسیارم لەسەر ئایین لە ڕوانگەی فرۆییدییەوە ئەوەیە فرۆید ئەڵێ.. ئاین لەسەر بنچینەی ترسان لە (خوا) دانراوە.. کە ئەمیش لە خۆشەویستی و یەکتری ویستن، دوورمان ئەخاتەوە.. تۆ ڕات چۆنە..؟

**نەورەسی:** بەڵێ لای فرۆید ئایین لەسەر بنچینەی ترس و ڕق هەستان و پەیوەندییەکی (ماسۆشیزم)ییەو ئایین لە ئەنجامدا ئەبێتە پوچەڵکردنەوەی وزەی خۆشەویستی مرۆڤایەتی. بەڵام:

١. ئەم بیرە هەڵەیەی فرۆیدی تاپۆی نێو بوومەلێڵی بیرەوەری ئایینی جوولەکە پەتیەکەیتی و ئەیەوێ ئەو هێلکەیە بەسەر ئێمەدا بشکێنێ...زۆر ڕاستە کە ئایینی جوولەکەی ئێستا لەسەر ئەم ترس و دڵ ڕەقییە داڕێژراوە.

٢. ئایینی ئێمە ئایینی خۆشەویستیە.. بەهەشت گیان، هەر وەکو لە ڕوانگەی فرۆیدیزمیدا هەموو هەڵسوکەوت و هەستێکی خۆشەویستی مرۆڤایەتی بە پاڵەپەستۆیەکی جنسی دائەنێ و جەمسەری هەموو خۆشەویستیەك ئەبەستین بە خۆشەویستی (خوا)وە.. جوانی سروشت و خۆشەویستی ئەو جوانییە، پرشنگی جوانی و خۆشەویستی خوایە.. هەر سیفەتێ لە سیفەتەکانی خوا مەڵبەندێکی ئەو خۆشەویستیانەن کە ئێمەی مرۆڤ (بەخۆمان بزانین یان نەزانین) خەریکی پەرستنینی.. خۆشەویستی وڵات و نیشتمان و دایك و براو خۆشەویستی هونەرە جوانەکان و جوانی پەرستنی سیفەتەکانی (معطی، وهاب، رزاق، حافظ، مقیت)ە.. هونەرمەند لە خۆشەویستی سیفەتەکانی (الباریء، المصور) خەریکی گوشینی مێشکی خۆیەتی.. بوێژو فەیلەسوفەکان لە خۆشەویستی سیفەتەکانی

(الحق، العليم، اللطيف، الخبير، المحيط) بونەتە پەپوولەو خولیای نووری خوا بون نەك لەبەر ترس[٤٧].

٣. فرۆید، جوولەکایەتی بەرچاوی گرتووەو نازانێ لە ئیسلامی ئێمەدا پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوا، پەیوەندی خۆشەویستییەو ڕابەری ئەو خۆشەویستیەش پێغەمبەری سەروەرمانە ﷺ

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ ﴾ آل عمران:٣١

ئەی محمدی فورستادە بڵێ بە موسڵمانەکان و هەموو مرۆڤانی سەر زەوی ئەگەر وێڵی خۆشەویستی خوان وەرن شوێن من (پێغەمبەر) بکەون خوایش ئێوەی خۆش ئەوێ.

٤. (ئەرێك فرۆم) ئایینەکان ئەکات بە دوو بەشەوە: هەندێ ئایین لە سەر بنچینەی ترس و بەگوێ کردنی کوێرانەی بێ بیرکردنەوە دانراوە.. . وەکو ئایینی جوولەکە[٤٨]- هەندێ ئایینی تر لەسەر بنچینەی خۆشەویستی و مرۆڤایەتی و بیرکردنەوە داڕێژراوە . وەکو ئایینی ئیسلام و ئایینی مەسیحی - .. جۆری یەکەم بە

---

[٤٧]- گۆڤاری (صباح الخير)ی میسری ژمارە (١٠٣١) ڕۆژی ١٩٧٥/١٠/٩ (الحب الالهي) د: مصطفى محمود، ل٢٣.

[٤٨]- ئێمەی موسڵمان بڕوامان بە ستەمکاری هیچ ئایینێکی ڕاستەقینەی ئاسمانی نیە... چونکە سەرچاوەی هەموو ئایینەکان خوایە ... بەڵام بەهۆی نەمانی ئایینە ڕاستەکەی جوولەکەو دەخەل کردنی یەوە بووە ئایینی ستەمکاری و ئایینی (فرۆید).

ئاینی خۆسەپێن و ستەمکاری (authoritarian) ناو ئەبات و جۆری دووهەم بە ئایینی خۆشەویستی و مرۆڤایەتی (humanistic) ناو ئەبات.. هەروەها (ئەریك فرۆم) ئەڵێ ( لەو ئایینانەی لەسەر خۆشەویستی و مرۆڤایەتی دامەزراون یارمەتی ئادەمیزاد ئەدەن بۆ بەکارهێنانی ژیری و هێزی خودی و خۆیان بۆ دابین کردنی بەختیاری و کامەرانی خەڵکی ترو پێشخستنی کۆمەڵ بەرەو ژیانێکی خۆشتر... بەلام ئەو ئایینە ستەمکارو خۆسەپێنەکانی تر ناهێڵێ مرۆڤ بیر بکاتەوەو تەنیا پشت ئەبەستێ بە هێزێکی میتافیزیکییەوە هەتا وزەی دادخوازی و ڕاستی پەرستی و خۆشی لە مرۆڤدا ئەکوژێ مرۆڤێکی وا ڕەشبین دەرئەچێ[٤٩].

سەرەڕای ئەوەی هەرچی فرۆید بەرامبەر ئایین ئەیلێ، مەبەستی خۆحەشاردان و چاوڕاوە لە لاوەکانی موسلمان و مەسیحی و خەنجەرێکی ژاراوی جوولەکانەیە بۆ قەپرغەی ئێمە، سەرەڕای ئەمانە وا بە چاوی خۆت دیت هەر ئەو بەڵگانەش فرۆید کردبوونی بە دێوجامەی ڕاوی گێلە موسلمان، هەر هەموویان بەدرۆ خرانەوە.. جگە لەوەی بەهەشت گیان لەم وڵاتە ئیسلامییانەی ئێمەدا کافرو ملحد و بێباوەڕی ڕاستەقینە نیە،

---

[٤٩]- الأنثى هي الأصل، د.نوال السعداوي، ل٢١٩-٢٢٠.

هەر بیروباوەڕێکی دوور لە خوا لەم وڵاتانە سەرهەڵدا باوەڕێکی زۆڵەکەو تەمەن کورتە وەکو هەموو نەخۆشییەکی لەش، چەند هۆو کاتێکی تایبەتی یارمەتی پەیدابونی داوە.. ئەگینا ئەگەر بە وردی سەیری سۆزی هەر (ملحد)ێك لەم خوانەناسانەی لای خۆمان بکەیت تارمایی باوەڕو جار جار گەڕانەوەی نیوە ناتەواویان بۆ لای خوا تێدایەو زۆر جار خۆیشیان بە خۆیان نازانن و پێیان نەنگە دەریبڕن.. نموونە زۆر زۆرە و ناژمێررێت.. بەڵام وەکو بیر خستنەوەیەك:

١. باوکی کاك (هیوا)ی هاوڕێمان کاتی خۆی لە (سید صادق) بوو ئەزانی چۆن بوو..؟ پیاوێکی عارەق فرۆش عارەق خۆر و زۆر دوژمنی ئیسلام بوو.. ئەم کاك (هیوا) قوتابی پۆلی سێهەمی ناوەندی بوو . کە ئێستا لە زانکۆیە ـ خوا یارمەتی بدات و سەرکەوتوو بێ . جار جار نوێژی ئەکرد و ئەهات بۆ مزگەوت لە (محاضره)و خوتبەکانی مامۆستا شارەزووریدا بەشداری ئەکرد.. باوکی پێی زانی بەتیژترین شێوە بەربەستی ئەکرد.. لە ماڵەوە هەر کتێب و کاسێتێکی ئیسلامی بەرچاو بکەوتایە لێی ئەسەندو پارچە پارچەی ئەکرد و تا دواجار وای لێکرد هەرگیز نەیئەوێرا لە ماڵەوە بە ئاشکرا نوێژ بکات..

هەر کاتێ بیویستایە نوێژ بکات یان لاپەڕەیەك قورئان بخوێنێ ئەبوایە یان دایکی یان یەکێك لە خوشکەکانی پاسەوانی بونایە نەوەك لەپڕ باوکی بەسەردا بێتەوە.. خۆ ئەگەر ڕاپۆرتی بۆ برۆشتایە کە ئەمڕۆ چاوی بە مامۆستا شارەزووری کەوتووە یان چۆتە مزگەوتەکەوە، ئەوە ئەو شەوە بێشێو سەری ئەنایەوە، سەرەڕای هەندێ شەقکاری.. ئەم کوڕە بەسەزمانە بەم شێوەیە مایەوە هەتا خوای من و تۆ کردی و باوکەی گۆبە (ئیفلیج) کردو دەمی خوارو کەنەفت و کەلەلا.. چەند پزیشك و داودەرمانی بێ سوود چارەی نەکرد... وەکو کوردەکە ئەڵێ ( کاتێ دەست بڕا لە هەموو لایە، نۆرەی ڕەحمی حق تعالی یە ).. کوڕەکەی بانگ کردو دەستی کردە ملی و سەربەستی نوێژو ڕۆژووی پێ بەخشی.. نەخێر بەمەیشەوە نەوەستا داوای لە کوڕەکەی کرد کە ئەمیش فێری نوێژ بە (جەماعەت) بکەن.. عارەق خواردنەوە هەموو ڕواڵەتێکی خواردنەوە لەماڵەکەدا گسك دران و پێچرانەوە بۆ هەتا هەتای.. دواجار هاتن بۆ مزگەوت و..

٢. بەهەشت گیان سەرت سوڕ نەمێنێ و واقت گێژ و خول نەخوات کە هونەرمەندێك، چەند دوور لە خواو ئایین بژی، سۆزی ئایینی و هەستی خواپەرستی لەدڵیدا ڕیشەکێش ناکرێ.. ئافرەتێکی هونەرمەند .وەکو خۆیان ئەڵێن ـ کاتێ

باسی ئەو سۆزو هەستە ئەکات ئەڵێ (.. ئای چەند بەیانیان بەدەم بانگی بەیانییەوە لەخەو ڕائەپەڕیم و بەڕووت و قووتی لە باوەشی کابرای نەناسراودا دەرئەچووم و هەڵئەلەرزیم و هەستم بە دەرزی ئاژنین و گاز و پێوەدانی دووپشك ئەکرد لەو شوێنانەی ئەو پیاوە ماچی کردبووم و شەو لە باخەڵیدا مابوومەوە.. بە پەلە ئەڕۆیشتم بۆ گەرماوەکەو لەژێر دووشەکەدا زۆر زۆر ئەمامەوەو هەستم ئەکرد بەوەی نەك تەنیا لەشم پیسە، بەڵکو هەموو خانەیەکی لەشم پیسە...) [٥٠] ئەمە هەستی ئافرەتێکی سۆزانیی دوور لە هەموو ڕواڵەتێکی ئایینیە.

٣. ئێمەی موسڵمان خۆمان بە بەندەو دیلی جنس نازانین و ئایینەکەمان لە ئەنجامی پاڵەپەستۆی جنسەوە دروست نەبووە بەڵکو خۆمان بە (خەلیفە)و جێدار و نیشتەجێی دروستکەرەکەمان (خوا) ئەزانین، ئایینەکەمان پێمان ڕائەگەیەنێ کە هەرگیز خوا مرۆڤی خوێڕی نەکردووە بەڵکو یەکەم مرۆڤ (ئادەم) خۆی پێغەمبەری خوا بووەو دروستکەرەکەی نەخشەی هەڵسوکەوتی بۆ دیاری کردووە.. ئیتر لەو کاتەوە ئێستا بەپێی پێویست خوا پێغەمبەر و فروستادەی ناردووەو لە هەڵەت و لاڕێی ژیان پاراستوونی.

---

[٥٠]- نار تحت الرماد، ص ١٧.

**بەهەشت:** کاکە گیان ڕات بەرامبەر زانیاری (فینۆمینۆلۆجیای ئایینەکان) چییە..؟

**نەوڕەسی:** خوشکێ گیان، ئەویش داوێکە لە داوەکانی جوولەکە بۆ لاوەکان، بەناو زانایانی ئەو زانیارییە ئەیانەوێ بە خەڵکی بڵێن پێویستە واز لە ئایین بهێنین چونکە ئایین (هەموو ئایینێک) لە کۆمەڵێ ئەفسانەی پڕووپووچەوە دەستی پێکردووەو ئەفسانەیە، بەڵام ئەمە ڕاست نیە کە ئایینەکان لە ئەفسانەوە هاتبن.. بە پێچەوانەوە هەموو ئایینەکانی ڕاستی لە خواوە دەستی پێکردووەو لە زاناترین زاناو باڵاترین سەرچاوە بونەوەرەوە دەستی پێکردووە، بەڵێ زۆرجار بەهۆی دورکەوتنەوەی خەڵکییەوە لەسەرچاوەی ئایینەکەیان تووشی ئەفسانە و بیری پڕووپووچ بون.. ئەوەتە لە شارەزووری خۆمان ئەبینین کە زۆر گێلە موسڵمان ئەڕۆنە سەر زیارەتەڵان و قسن شەخس، دارو بەرد ماچ ئەکەن و داوای کوڕو کچی لێ ئەکەن و (مێلۆ) ئەگرێتەوەو هەرچی تێکەڵاوی ئەبێ بیخوات، زۆرجار (بەڵکو زۆرترین جار) ڕیقنە چۆلەکەی تێئەکەوێ و ئەیخوات.. ئایا ئەمە چۆنە لەگەڵ گیانی ئایینە پیرۆزەکەی ئیسلامدا..؟؟!

سەرەڕای ئەمەیش، بەهەشت گیان، ئەگەر سەیری دەست پێکردن و لەدایك بونی زانیاری پزیشکی بکەین، ئەبینین لە

کۆمەڵێك ئەفسانەو نووشتەو چاو و ڕاوە دەستی پێکردووە. بڕۆ مێژووی زانستی پزیشکی بخوێنەرەوە سەیر ئەکەین، پزیشکی لە سەرەتاوە ئەفسانەیەکی ڕووتی دوور لە هەموو گیانێکی زانیارییە.. جا ڕاستە بڵێین با ئاشبەتاڵ لە زانیاری پزیشکەوانی بهێنین و دەرگای خەستەخانەکان و مەڵبەندەکانی چارەسەری نەخۆشیەکان دابخەین، چونکە لە ئەفسانەوە هاتووە.. لەگەڵ ئەوەیشدا ئاییني پیرۆزی ئیسلامی ئێمە لە کانیاوی قورئان هەڵگیراوە، کە هەموو زانایانی سەر زەوی سەرگەردان و سەراسیمەن و سەری قوتابیێتی بۆ ئەخەوێنین، بەهەشت گیان حەز ئەکەم ئەمشەو سەرباسی (الدين والفطرة) لە کتێبی (دراسات في النفس الأنسانية) بخوێنیتەوە[51].

ئەمانەو هەزاران نموونەی تری ڕۆژانەی ژیانمان دەری ئەخات کە هەموو دەردێکی ئەم وڵاتە ئیسلامییە خواپەرستانە تەنیا بە گەڕانەوەیان بۆ لای خواو پەیامە بێگەردەکەی خوا چارە ئەکرێ، نەك بە داروینی و فرۆیدو دارو بەرد پەرستیی.. هتد.

---

[51]- ل: ٢١١

## جنس لە ڕوانگەی فرۆیدییەوە :

بەهەشت: کاکە گیان وا ئەمشەو دێینە سەر فرۆید و سێکس، ئەتوانم بڵێم ناوکرۆك و کاکڵەی فرۆیدیزمەو هەموو توێژینەوەکانی تری فرۆید بە دەوری ئەم مەسەلەدا ئەخولێتەوە.. بەڵام پێش ئەوەی بێیتە سەر باسەکەمان، با بەبێ توێکڵ پێت بڵێم کە (شەرم لە ئاییندا نیە) و ئەبێ زۆر بێ پەردە ئەم مەسەلەم بۆ باس بکەیت.

ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕێگا لە موسڵمان (چ ژن چ پیاو) ناگرێت کە ڕۆشنبیری جنسیان هەبێ بەڵکو بە پێچەوانەوە کتێبە (فیقهی)یەکانی خۆمان پڕ بە پڕی پێستی خۆی باسی مەسەلەی جنسیان کردەوەو خستوویانەتە بەر نەشتەری توێژینەوە.. ئەوەتە دایکی موسڵمانان (عائیشە خاتوون ـ خوا لێی ڕازی بێت) زۆر جار ئەیفەرموو (ڕەحمەتی خوا لە ژنە یاریدەدەرە مەدینەییەکان . الأنصا رـ کە بەبێ شەرم و شکۆ هەموو پرسیارێکی خۆیان لە پێغەمبەری خوا ئەکەن..) سەرەڕای ئەمانە، کە سەیری قورئانی پیرۆزیش ئەکەین لە زۆر جێگادا باسی کێشەی جنسی و مەسەلەی جنسی ئەکات، خۆ ئەگەر هەندێ کەس وا تێنەگەن . یان وایان تێگەیاندوون ـ ئایین کۆسپە لەڕێی ڕۆشنبیری جنسی دا، وانیە بۆ هەر ئایینێکی تر

وا بێ بۆ ئیسلام هەر وانییە.. چونکە ( لە کاتێکدا کە مرۆڤ هیچ شارەزاییەکی نەبووە لە زانستی و زانیارییەکانی فسیۆلۆجی و بایۆلۆجیدا، قورئان، پێش چواردە سەدە دەستنیشانی مەسەلە جنسییەکانی مرۆڤی کردووەو وەکو بەشێکی گرنگی ژیانی ئادەمیزاد سنوور و ڕێڕەوی خۆی بۆ دیاری کردووە[٥٢]

جا بۆیە داوات لێ ئەکەم تۆیش بەڕوونی و بێ گێژو خول بۆم باس بکەی..

نەورەسی: بە چاوان بەهەشت گیان، شەرمی ناوێ.. چونکە مەسەلەکە مەسەلەیەکی زانستی ڕووتە و مەبەستمان ڕوون کردنەوەیە وشەی جنس (سێکس . Sex) لە بنچینەدا وشەیەکی لاتینیە، مانای بەشکردن و لەت کردن ئەبەخشێ، وە مەبەستی ئەوەیە کە مرۆڤایەتی ئەکاتە دوو بەش، نێرو مێ، ژن و پیاو، کوڕو کچ[٥٣]. بەڵام جنس وەکو تێکەڵ بونی پیاو لەگەڵ ئافرەت (نێرو مێی مرۆڤ) لە سەرانسەری مێژووی مرۆڤایەتیدا لاسەنگ بووە. جاری وا هەیە . لە لاپەڕەکانی مێژووی کۆن و نوێ و جێگای نزیکو دوورەکانی سەر زەوی دا ـ ئەوەندە (بەن)ی بۆ شل کراوە لە سنووری ئادەمیزادان دەرچووەو کۆمەڵگەیەکی

---

[٥٢]– دراسات في الكتاب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة، ص٢٣٤.

[٥٣]– دراسات في علم النفس، ل٩٨.

ئاژەڵی و دوور لە خووڕەوشتی مرۆڤایەتی دروست بووە.. . جارێکی تر ئەوەندە توند جنسیان سەرکوت و خەفە کردووە لە وزەی مرۆڤایـــەتی دەرکـــراوە بـــۆ فریشـــتەیەکی ڕووت و گیانەوەرێکی گیانی. جا ئێستا پێش ئەوەی باسی هەڵوێستی ئـاییني ئیسـلام و ئایینـەکانی تـرت بـۆ بکـەم، لـە ڕوانگـەی فرۆییدیەوە سەرێکی جنس دەکەین.

وەکـو خـۆت لـە پێشـەوە وتـت، فرۆیـد هـەموو ژیـانی بـۆ جنسبازی تەرخان کردبوو، وەکو بڵێیت فرۆید تەنیا بۆ ئەوە دروسـت کـراوەو ئـەوەی پێـی سـپێرراوە کـە مـرۆڤ بکاتـە گیانداریکی جنسی ڕووت و لە هەموو ڕواڵەتێکی تری ئادەمی ڕووتی بکاتەوە، جنس لە ڕووانگەی فرۆییدییەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا بەدی ئەکەین:

١. فرۆید لای وایە (جنس) تەنیا ئەوە نیە کە ئێمە ئەیزانین و ئەیناسین، بەڵکو (جنس) خولگە (مدار)ی هەموو هەڵسوکەوت و بیرکردنـەوەو تەنانـەت وزەی مرۆڤـەو سـەروبەری ژیـانی ئـەم ئـادەمیزادەی داپۆشـیوە ئـەڵێ، چـیرۆکی کوشـتنی باوکـە (خەیاڵیە)کـە لەلایـەن مناڵەکانـەوە بەڵگەیـە بـۆ ئـەوەی هـەموو بیرکردنەوەیـەکی مـرۆڤ بیرکردنەوەیـەکی جنسـیە و هەڵپـەی جنسییە، بەڵام پاش کوشتنی باوکەکە بۆیان دەرکەوت کە ئەبێ

يەكتری قەلآچۆ بكەن بۆيە چاريان نەما جگە لە خەفەكردنی جنسەكەيان نەبێ و خەفەيان كرد.[٥٤] لای فرۆيد (پاڵەپەستۆی ڕابواردن و جنس و وێرانكاری جڵەو دەستی مرۆڤە و خۆی خاوەنی خۆی نیيە)[٥٥] هەتا ئەڵێ (نمونەی داهێنانی هونەری و ئەدەبی و ڕۆشنبیری، هەموويان لە وزەی جنسيەوە سەرچاوە هەڵ دەگرن و غەريزەی جنسی سەركردەو ڕابەرايەتی مرۆڤ دەكات)[٥٦].

لای فرۆيديزم ئەدەب، ئاوێنەی ئێش و ئازارەكانی كۆمەڵ نیيە و پەيوەندی بە دەردەكانی كۆمەڵەوە نیيە بەڵكو (٩٩٪ كتێبە ئەدەبيەكانمان دڵداری و جنسە)[٥٧].

٢. لای فرۆيد جنس لە يەكەمين ڕۆژی لەدايك بونی مرۆڤەوە و لە يەكەمين ڕۆژی هەست كردنی بە برسێتی ورگی، هەستيش ئەكا بە برسێتی (جنسی)و لای وايە كاتێ منداڵ (كوڕپە و ساوا) مەمكی دايكی ئەمژێ بە ئارەزوويەكی جنسييەوە ئەيمژێت، وەكو برسێتی سكی بە شيرەكە ئەشكێنێ[٥٨]) و (كاتێ منداڵ خۆی

---

[٥٤]- نظرية فرويد، الفلاحي، ص:٩.

[٥٥]- گۆڤاری (العربي) كوێتی ژمارە (٢٦٧)، ل (١٤٨).

[٥٦]- ئافرەت لە چيرۆكی كورديدا، ل٢٧٤

[٥٧]- أسرار النفس، ص ٧٥.

[٥٨]- الأنسان بين المادية والأسلام، ص٢١٢.

ئەلکێنێ بە سنگی دایکییەوە ئەو خۆ نوساندنە پاڵەپەستۆیەکی جنسیە[59]) ئیتر سۆزی دایك و فرزەندی . لای فرۆید ـ شتێکی دوور لە زانیارییە (ماشاء الله لەم زانیارییە).

.. منداڵ لە دەست مژینەوە فێری مەمك ئەبێ، دەست مژینەکەیشی بۆ پڕکردنەوەی برسێتی جنسییە)و منداڵ کە خۆی ئەخورێنێ، جنسە[60] لای فرۆیدیزم (گیانداران لەبەرئەوە دەنگدارن و دەنگیان هەیە بۆ ئەوەی نێرینەکانیان مێینەکانیان وە مێینەکانیان نێرەکانیان ڕاکێشن بۆ لای یەکتر.. لەو هەستەوە دەنگ و زمان پەیدا بوو)[61].

٣. لای فرۆید منداڵ (کوڕ) ئەچێ لە دایکی و حەزی لێ ئەکات، دوایی سەیر ئەکات باوکی وەکو کێوێك بەری ئەو حەزە (جنسیە)ی گرتووە، ئەو کوڕە هەژارە . ناچار حەزەکەی خەفە و سەرکوت ئەکات و تا دواجار تووشی نەخۆشی گرێکوێرەی (ئۆدیب) ئەبێ (!!!) هەروەها (کچ) حەزی جنسی و ڕابواردن لە باوکی ئەکات، کەچی دایکی وەکو (شەملی شەڕ) بقڤەی پێ ڕائەگەیەنێ و قەدەغەی حەزەکەی ئەکات باوکی (ئەو کچە

---

[59]– هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[60]– الجنس عند فروید، ص٧٠-٧٣.

[61]– اسرار النفس، ص١٨.

هەژارە) داگیر ئەکات (تەنیا) بۆ خۆی.. هەرچەندە کچەکە حەز ئەکا وەکو ژن و مێرد لەگەڵ باوکیدا گەمەو گاڵتە بکات.. دایکە (کۆسپە)کەی سەرکوتی ئەکات ناچار حەزەکەی خەفە ئەکات، تا لە دواییدا تووشی (نەخۆشی) گرێی (ئەلێکترا)ی دەروونی ئەبێ.. ئیتر ئەم گرێ کوێرانە بونە هۆی ئەوەی مرۆڤ ئایین و ویژدان و ڕەوشت و نەریت و هەموو ڕەوشت بەرزییەك لە ژیانداو سەرانسەری مێژوویی دوورو درێژی مرۆڤایەتی لە ناچاری دروست بکات[62] فرۆیدیزم ئەڵێ (وا چاکە باوك و دایك زۆر لەگەڵ کوڕو کچەکانیان یاری و گەمە نەکەن چونکە ئەبێتە هۆی زوو ڕەس و زوو پێگەیشتنی غەریزەی جنسییان[63].

٤. فرۆید ئەڵێ[64] وەنەبێ تەنیا مناڵ (کوڕ حەز لە دایکی و کچ لە باوکی) حەزی جنسی هەبێ، بەڵکو زۆرجار دایك (یش) بە هەستێکی جنسییەوە سەیری منالە (کوڕ)ەکەی ئەکات، و ئەیلکێنێ بە سنگییەوە ختوکەی ئەدات، بە ئاشکرا هەستێکی جنسی لە دایکەکەدا. ئەوە کوڕەکە هیچ کە لە جیهانێکی جنسی ڕووتدا دەژی. دەرئەکەوێت).

---

[62] – التطور والثبات في حياة البشرية، ص٤٨.

[63] – الجنس عند فرويد، ١٢٣.

[64] – سەرچاوەی پێشوو ل١٢٢ وە سەیری گۆڤاری کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا ٣٢، سالی ١٩٨٢، ل٢٦٦-٢٧٢ بکە.

**بەهەشت:** بۆ خاتری خوا ئەمەیە (زانیارییەکەی فرۆید و بەم زانستە جوانەوە ( بۆتە پێشەوای زاناکانی جیهان ) وەکو جاش جووەکانی لای خۆمان ئەڵێین.

**نەوڕەسی:** ئەی چاوەڕێی چی ئەکەیت لە جوو و جاش جوو..؟

٥. جا بەهەشت گیان لای فرۆیدیزم ئەو حەزە جنسییە بە گەورە بونی منداڵەکە لەیاد ناچێتەوە بەڵکو (کچ زیاتر حەز لە کوڕێك ئەکات کە لە دایکی بچێت.. چونکە وێنەی یەکەم دڵداریان ـ باوك بۆ کچ و دایك بۆ کوڕ ـ لە یادناچێتەوەو هەوڵ ئەدا ئەو هیوایەی بێتەدی یان لەو وێنەیە نزیك ببێتەوە..)[٦٥].

٦. بەهەشت گیان ـ فرۆید ـ وەکو هیچ نرخێکی بۆ مرۆڤ نەهێشتووە هەروەها کاری مرۆڤانەو چاکەکردن و دەستگرۆیی هەژاران و یارمەتی برای هاو ئایین و هاونیشتمان و هاو مرۆڤ بە نەخۆشی دەروونی ئەداتە قەڵەم.

**بەهەشت:** چۆن!؟!

**نەوڕەسی:** فرۆید ئەڵێ[٦٦] (کاتێ ئەبینی یەکێك یارمەتی هەژارێك ئەدات و پارەی ئەداتێ) ئەمە لەبەر خواو ئایین و ئەو جۆرە شتانە نییە بەڵکو ئەو کابرایە کاتێ ئەو هەژارە ئەبینێ

---

[٦٥] – اسرار النفس: ١٣٧.

[٦٦] – تطور العلاقات الجنسية بين الرجل والمراة، ص٣١٥.

هەست بە جۆرە ئازارێکی دەروونی ئەکات، جا بۆ شکاندنی ئەو ئازارەو پشووردانێکی دەروونی یارمەتی ئەو هەژارە ئەدات، ئەویش جۆرێکە لە نەخۆشی حەز لەخۆکردن..

**بەهەشت:** حەز لەخۆکردن..؟!

**نەورەسی:** بەڵێ بەهەشت گیان ژیان لای فرۆید هەموو حەزی جنسە، حەز لەخۆکردن، حەز لە دایك و باوك، حەز لە هەموو شتێك تەنانەت حەز لە سەگ و بەرازیش.. بەهەشت گیان، بنچینەی هەموو تیۆری فرۆید و ـ هەموو مادییەکان و جاش جوویەک ئەفسانەیە.. لە ئەفسانەی کۆنی ـ گریکەکان ـ یۆنانی کۆن ـ ئەغریق ـ ئەگێڕنەوە کە گوایە شوانێکی لاوی پێکەوتووی جوان و شێوە شیرین کە ناوی (نارسیس) بووە، جارێك لە ڕۆخی چەمێکدا بەسەر گاڵۆکەکەیەوە سەر شۆڕ ئەکاتەوە بۆ ئاوەکەو و ڕواڵەت و دەم و چاوی خۆی تێدا ـ لە ئاوەکەدا ـ بەدی ئەکات و دڵی لەخۆی ئەچێ و حەزێکی (جنسی) لە خۆی ئەکات.. جا هەموو ڕواڵەتێکی حەز لەخۆکردن بە نەخۆشییەکی دەروونی ناو ئەبەن و پێی ئەڵێن (نارسیزم = Narcissism = النرجسية = عشق الذات) بەناوی ئەو شوانە یۆنانییەوە)[٦٧] ئیتر خێرو پاداشتی لای خوایی نییە، بەڵکو ئەو کابرا (نارسییزم) بووە.

---

٦٧- هەر ئەو سەرچاوە و لاپەڕە.

٧. لای فرۆیدیزم ـ ڕۆژئاوا بەگشتی ـ جنس هیچ پەیوەندییەکی نیە بە ڕەوشتەوە.. کابرای شەڕواڵ پیس، یان ژنەی داوێن پیس و سۆزانی پێی ناوترێ بەدڕەوشت چونکە (مەسەلەی جنسی مەسەلەیەکی بایۆلۆجی ڕووتە)[٦٨].

٨. لای فرۆید، شارستانیەتی ئەمڕۆی سەرزەوی لە ئەنجامی خەفە کردنی جنسی و سەرکوت کردنی ئارەزوو دروست بووە[٦٩].

بەکورتی بەهەشت گیان . ئەم فرۆید ـ ە بە شێوەیەك مرۆڤی جنس پێچ کردووە، هیچ گۆشەیەکی ژیانی ئەم مرۆڤە نیە بەئارەزووی جنسی و سێکسی تەیمان نەکرابێ و چەپەری فرۆیدی بەربەستی هەموو تروسکاییەکی ڕەوشتی نەکردبێ.

بەهەشت: باشە ئەگەر ئەمە هەموو زانیاری و فەلسەفەو زانایی دەروونناسی و شیتەڵ کردنی دەروونییەکەی فرۆیدە.. چۆن ئەو خەڵکەی ئەوروپای بۆ بەنگ کێش کراو دەرپێی ئابڕو و شەرەفی لە لنگ داماڵین و چۆن توانی ئەوە بکات کە کردی..؟

نەوڕەسی: بەهەشت گیان هۆی پەرەسەندنی ئەم بیرە زۆر کۆنە ئاژەڵییەی فرۆید چەند شتێك بوو:

---

[٦٨] – محاضرة (الأسلام والحضارة الغربية حەج ی ١٣٩٩ی کۆلە (سعودیە).

[٦٩] – الأنسان بین المادیة والأسلام، ص٢١٢.

١. ئەگەر کتێبی (پروتوکولات حکماء صهیون)ت خوێندۆتەوەو دێتەوە یادت بەندێکی سەربەخۆی لەسەر فرۆید ئەڕوات و سوپاسی ئەکات، هەتا لە دواییدا ئەڵێ (پێویستە بەشێوەیەك ڕەوشت و ئایین لەپێش چاو لاوەکانی ئومەمی (گەلانی سەر زەوی جگە لە جوولەکە) سووك بکەین نەهێڵین هیچ شتێکی پیرۆز بە پیرۆزی لەپێش چاویان بمێنێ و کارێکی وایان پێبکەین لەبەرچاوی خەڵکی بە ڕۆژی نیوەڕۆ و لە جێگا گشتیەکاندا کوڕ و کچ سواری یەکتری بن و شەرم نەمێنێ).

کەواتە . وەکو لە پێشەوە باشتر بۆت دەرکەوت . فرۆید کادێرێکی دڵسۆزو کاسەلێسی زایۆنی جیهانییە و بە هەموو هێزێکی پشتیوانی ئەکەن بەڵکو خۆیان بە خاوەنی ڕاکانی فرۆید ئەزانن و پشتگیری . ئەکەن.. خۆ ئەو کاتە . بەڵکو ئێستایش . بۆرجواز و کەڵە دەوڵەمەندەکانی ئەورووپاو خاوەنی دەزگا چاپەمەنییەکان و سالۆنی سینەماکان و دەرکردنی فیلمەکان و هتد.. هەموویان جوولەکە بون و جوولەکەن.. چا هەر وتەیەك و نەخشەیەکی ڕوخاندنی ڕەوشت لە دەمی فرۆید دەربچووایە هەموو ئامێرەکانی ڕاگەیاندنی ئەورووپا خەریکی چەسپاندن و پراکتیکی بون و ئەیانسەپاند بەسەر کۆمەڵگادا.

٢. لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و تەقەللای کە جوولەکە ئەیدا بۆ چەسپاندنی پاکانی فرۆید کەچی ئەو ڕەنگەی کە جوولەکە ئەیویست نەیدایەوە، هەتا لەکاتی فرۆید خۆیدا جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤ـ ١٩١٨) ڕوویداو ئەمەیش هەلێکی زێڕین بوو دەستی جوولەکە کەوت.. بەهەشت گیان سەرەڕای ئەوەی کە هەموو کاتێك ڕێژەی ئافرەت کەمترە لەپیاو و بەپێی سەرژمێری و لێکۆڵینەوەی پزیشکەکان و پسپۆڕانی سەرژمێریار هەموو کاتێك ڕێژەی لەدایك بونی کوڕ لەچاو لەدایکبونی کچدا بریتیە لە ١٠٦٪ بە ١٠٠٪ی کچ واتە ئەگەر ١٠٠ کچ لەدایك بن، ١٠٦ کوڕ لەدایك ئەبن[٧٠]، بۆ نموونە عێراق لە سەرژمێرییەکەی ساڵی ١٩٦٥دا کە دانیشتوانی عێراق بریتی بوو ٥٢٧,٢٦١,٨ کەس، ڕێژەی پیاو لەچاو ئافرەتدا بریتی بوو لە (١٠٢٪ بە ٩٨٪) واتە هەر (٩٨) ئافرەتی عێراقی بەرامبەر بون بە (١٠٢) پیاوی عێراقی جا سەرەڕای ئەم ڕێژە گەورەیە کە خوا خۆی دروستی کردووە . چونکە ئەزانێ ئەرکی ژیان و پاراستنی نیشتمان و قوربانی بەسەر شانی پیاوانەوەیە. سەرەڕای ئەم ڕێژە لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا زیاتر لە دە ملیۆن گەنج کوژران و سەرنگوم بون (دە ملیۆن بۆ ئەو کاتە زۆر بوو) ئافرەتێکی زۆری ئەورووپی بێ

---

[٧٠]– دراسات في علم النفس، ص٩٩.

مێردو بێ پیاو بوو بێ ئەوەی بتوانێ مێردێکی دەستکەوێ یان بتوانێ لە ڕووی ڕەوشت و ئایینێکەوە برسێتی جنسی تێر بکات خۆ ئایینی مەسیحییە کارتۆنەکەی ئەوروپایش، دەرگای یەك ژنە زیاتر (دوو ژنە)ی لەسەر پیاوان داخستبوو، جوولەکە هەلێکی زێڕینی دەست کەوت.. ئەویش ئەوە بوو بە فیلمی سینەمایی جنسی ئەو ئاگرە جنسییەی ئافرەتە . هەڵاتووەکانی ئەوروپا لە دەستی کەنیسەو هەموو ئایینێك ـ خۆش کردو ئافرەتی ئەوروپا بووە بووکەشوشەی دەستی جوولەکە.. چۆنی ڕووت بکردایەو چۆن لەژێر نەخشەی فرۆید و دوژمنەکانی تری ڕەوشتدا هەڵی بسوڕاندایەو بیکردایەتە ئامێرێکی ڕابواردن و جنس، ئافرەت خاوەنی خۆی نەبوو..

جوو، قۆڵی ڕەوشت ڕووخاندنی لێهەڵمالی.. تیۆرەکانی فرۆید لە چوارچێوەی توێژینەوەی سایکۆلۆجی دەرچوون، خرانەکار بۆ گەڕانەوەی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بۆ ئاژەڵێکی ڕووت و زۆر برسی بۆ جنس، تا لە ئەنجامدا فرۆید ـ ڕاستتر بڵێین جوولەکە توانی ڕەوشت و ئایین و هەموو شتێکی پیرۆز لە دڵی لاواندا ڕیشەکێش بکات.. لەم کاتەدا چەند قوتابخانەیەکی فیکری و هونەری و ئەدەبی دروست بوو بۆ زیاتر کردنی کڵپەی ئەو ئاگرە جنسییە هەر هەموو ئەو قوتابخانانە داوای شکاندنی

هەموو کۆتێکی ڕەوشت و ئایینیان ئەکردو، داوایان ئەکرد کاری جنسی بە ئاشکرا بکرێ و پێویست بە شاردنەوە ناکات.

بۆ ئەم مەبەستە بە دەیان چیرۆکی جنسی نووسرا، بە سەدان شانۆگەری جنسی ، ڕووت لەوپەڕی بەڕەڵاییدا پیشان درا.. هۆنراوەو وێنەو تەنانەت مۆسیقاو ڕۆژنامەکان خرانە کار بۆ دەرخستنی مەسەلە جنسیەکان و چڕکردنی تیشك لەسەر کاری جنسی.. چەندان نووسەری تایبەتی دانران بۆ دانان و نووسینی مەسەلە جنسییەکان و نەشە وەرگرتنی خوێنەران بە خوێندنەوەی وەکو (د.هـ. لۆرنس) و دەیانی تر[٧١]..

هەموو ئەدەب و ڕۆژنامەو گۆڤارو سینەماو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەورووپا (یان بڵێین ئەورووپایی ژێر چەپۆکەی فیکری جوولەکە) خەریکی ئەوە بون باسی چوونە سەر جێگای ژن و پیاوێك بەڕووتی و شێوەی ڕابواردنی جنسییان و چۆنێتی یەکتر لێستنەوەو هتد.. بکەن خۆ کامێرای سینەمایش بە شریتە گۆیاکەرە بە هونەری چیرۆك، هونەری دەرهێنان، هونەری وێنە، هونەری مۆسیقا، هونەری گۆرانی و ئاوازو هتد.. هەمووی خرابووە کار بۆ پیشاندانی ئەو ژن و پیاوە ڕووتەی سەرجێگا ڕووت و قوت لەبەردەم گلۆپێکی سفر، لەپێش چاوی هەزاران

---

[٧١]- معركة التقاليد، ص٣٤-٣٩.

(بەڵکو ملیۆنەها) ئافرەتی برسی بۆ مێرد، یان لاوی نێو ئەم هەموو ئافرەتە برسییانە.

٣. ئا لەم تاریکە شەوانەی مێژوودا تەنیا ئایینە ئەتوانێ ببێتە چرایەك و ڕێگای ڕاستی مرۆڤایەتی و ڕەوشت پەسەندی بۆ مرۆڤی سەرلێشێواو دەستنیشان بکات.. ئەوروپا ـ ئێستایش ـ کاسی لێدانە موسڵمانانە و مەردانەکەی صلاح الدینی ئەیوبی و جەنگە خاچەکان لە سەریاندا مابوو دەنگی ڕزگاری خوازی موسڵمانانیان نە ئەبیست، جگە لەوەی موسڵمانەکان خۆیان لە چەند لایەکی ترەوە لێیان قەوما بوو دوور کەوتبونەوە لە سەرچاوە ئایینەکەیانەوەو مامۆستایەتی کەسیان پێ نەئەکرا. ئەمە ئیسلام.. خۆ مەسیحیش ـ یان ڕاستتر بڵێین قەشەو پاپا پەرستەکان ـ هەڵوێستی نامەردییان بووە سەر باری ئەو هەموو بارە.

بەهەشت گیان وەکو لە پێشەوە وتمان کوژرانی ئەو هەموو لاوەو بێوەژن کەوتنی ئەو هەموو ئافرەتانەی ئەوروپا ـ تەنانەت کچەکانیش بێوە کچ بون، مێردیان دەست نەئەکەوت ـ ئایینی مەسیحی ـ بەناو ـ ئایینی ئەوروپای ئەو کاتە بوو، نەیئەتوانی کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکات و بەربەستی ئەو هەموو پیلانەی جوولەکە بگرێت و برسێتی جنسیان بشکێنێ چونکە:

أ. سەرچاوەی ئایینی مەسیحی کە ئینجیلە خەڵکی هان نادات بۆ ژن و ژنخوازی بەڵکو بە پێچەوانەوە ژن هێنان لای خەڵکی لیخن ئەکات و ناشیرینی ئەکات ـ بە پێچەوانەی ئیسلامەوە. ئەوەتە ئینجیل لە نامەکەی (پۆڵس) پێغەمبەری یەکەم کە بۆ خەڵکی (کۆرینتۆس)ی نووسیوە ئەڵێ[72]

(.. ئەمەوێ ئێوە دوور لە پەژارە بن.. پیاوی بێ ژن بیر لەوە ئەکاتەوە چۆن خوا لە خۆی ڕازی بکات . بەڵام ژندار لەم جیهانەدا هەر بیر لەوە ئەکاتەوە چۆن ژنەکەی لەخۆی ڕازی بکات.. خۆ جیاوازییەکی گەورەیش هەیە لەنێوان کچ و ژندا.. کچ . ئافرەتی بێ مێرد. هەر بیر لە خوا ئەکاتەوە ئەیەوێ بە پاکی گیانی و لاشەیی بمێنێتەوە، بەڵام ژنی شوودار بە ژیانییدا هەر بیری لای ئەوەیە چۆن مێردەکەی لەخۆی ڕازی بکات..).

هەر لەو (اصحاحە دا ژمارە: ٧) ئەڵێ (تۆ کە دووریت لە ژن، نەکەی ژن بێنی، خۆ ئەگەر ژنت هێنا نەکەویتە هەڵەوە، کچ بێنی چاکترە، بەڵام ئەوانەی ئەپێچڕێن بە ژن و ژنخوازییەوە لە تەنگەلانی لاشەدا ئەژین، من بەزەییم پیایاندا دێتەوە، وە ئەڵێ (ئەڵێم بەوانەی ژنیان نەهێناوە یان بێوەژن و بێوەپیاون بۆ

---

[72] – الكتاب المقدس، العهد الجديد، ص٢٧٥-٢٧٦.

خۆیان وا چاکە بەو شێوەیە بمێننەوەو وەکو من..) . ئەمە ئینجیلەو سەرچاوەی ئایینی مەسیحییە.

ب. وتەی قەشەو پاپاو پیاوانی ئایینی مەسیحی دەربارەی ناشرین کردن و سووککردنی ژن هێنان و شووکردن زۆر زۆرە بەڵام سەرجەمی هەمووی ئەوەیە کە پاپا (چۆم کرسۆستم) (Johm Crusostom) ئەڵێ[٧٣] (بەڕاستی ژن شەڕەو یەخەی پیاو ئەگرێ و چارەسەری نییە، ئافرەت دەستخەڕۆییەکی سروشتییە، ئافرەت بەڵایەکە حەزی لێ ئەکرێ، ئەفسانەیەکی کوشندەیەو تاوانێکی ڕازاوەی ڕەنگاوڕەنگە..). ئەگەر ئایینێك و بەرنامەیەکی ژیانی مرۆڤان لەم ڕوانگەوە سەیری ژن و مێردی بکات، چۆن ئەتوانێ ئەورووپا لەو قوڕە ڕەشە دەربهێنێ.

ج. ئەتوانین بڵێین کاتی هاتنی ئایینی جوولەکە مرۆڤایەتی لە دەوری منالیدا ئەژیاو لەکاتی هاتنی ئایینی مەسیحیدا مرۆڤایەتی لە دەوری لاوێتی و دەوری باڵغ بوندا ئەژیا، بەڵام کاتی هاتنی ئاینی ئیسلام مرۆڤایەتی گەیشتە پلەی ژیری و پێگەیشتن و لەشت گەیشتن و دانانی هەر شتە لە جێگای خۆیدا.. کەواتە جێی خۆیەتی کە ئایینی جوولەکە هەر لە سەرەتای هاتنیەوە وەکو بەرنامەیەکی ماددی وڕك گرتن لە شتی

---

[٧٣]- تطور العلاقات الجنسية بين الرجل والمراة، ص١٣٢.

ئەوسنی پشتگوێ خستنی یادی ڕۆژی پاداشت هات، بۆیە لە ئەنجامی ئەم پەروەرەییە مادییانەوە گەلی جوولەکە گەلێکی چاو برسی و چڵێسی و ڕۆچوو لە ماددیەتییان لێ دەرچوو، خواو ڕۆژی پاداشتیان لەیاد چووە.. جا بۆ ڕاست کردنەوەی ئەم بارە لارەی مرۆڤایەتییە و دانانی هاوکێشێك و پارسەنگێك بۆ لایەنی گیانی مرۆڤ، خوا ئایینی مەسیحی نارد، بەڵام کاربەدەستانی ئایینەکە بەهێز پاڵیان نا بە بارەکەوە دیسان بەوردیوواو بەلای گیانــدا لاســەنگیان کــردو مرۆڤیــان لــە هــەموو غــەریزەو داخوازییەکی لاشەیی سڕییەوەو وەکو فریشتە سەیریان ئەکرد.. تەنانەت عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) ئەفەرمووێ (ئەگەر چاوت ویستی تووشی گوناهێکت بکات . سەیری ئافرەتێك بکات ـ خۆت بە دەستی خۆت دەریبهێنە، چونکە پارچەیە لە لاشەت لەکیس بچێ و فڕێی بدەیت چاکترە لەوەی هەموو لاشەت و گیانت لەدەست بچێ و بڕۆیتە دۆزەخەوە..)[٧٤] وە ئەفەرمووێ (هەر کەسێ بەهەشتی ئەوێ و ئەیەوێ بەهەشتی بێ، نانی جۆو خەوتنی سەر سەرەلوێنك لەگەڵ سەگاندا، زۆرە..)[٧٥] لە ئایینی مەسیحیدا ڕێگای چوونە بەهەشت نانی جۆ

---

[٧٤]– الأنسان بين المادية والأسلام، ص١٠.

[٧٥]– من يطلب الفردوس فخبز الشعير والنسوم في المزابل مع الكلاب كثير....

خواردن و دەست کردنە ملی سەگ و خەوتنی سەر زبڵدان و سەرەلوێنکە.. بۆیە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەربێت) لە ژیانیدا خێزانی نەبوو ژنی نەهێنا.. پیاوە گەورەکانی ئایینی مەسیحی زۆرتریان بە بوخچەی نەکراوەیی ماونەتەوە..

د. ئایینی مەسیحی هەموو لاوەکانی ئەوروپیان بە کۆمەڵێ ترس پێچابووەوە نەیانئەوێرا هەناسە هەڵێنن، ترسی خوا، ترسی پاپا، ترسی باوك، ترسی شەرەف، ترسی لۆمەی کۆمەڵگا، ترسی، ترسی، ترسی.. ئەم هەموو ترسە سواری ملی بوو بون.. ئەم ترسانە هەموویان بە یەکجار و بەشێوەیەکی (هەستیری) شکان و نە مەسیحی و نە هیچ بیروباوەڕو ئایینێك بەرگەی نەگرت، کاتی خۆی ئایینی مەسیحی لە ئەوروپا ئەوەندە پیرۆز بوو پیاو نەیئەوێرا دەمی لێکۆڵینەوەیشی بۆ درێژ بکات، جنس و مەسەلەی جنسی ئەوەندە ناشیرین و قێزەون بوو خەڵکی لەناوبردن و لێکۆڵینەوەیشی ئەسڵەمینەوە و شەرمەزاری ئەیانگرت.. دوای ئەم لافاوە قەوانەکە هەڵیگێڕایەوە پیرۆزی ئایین درا بە جنس و لێکۆڵینەوەی جنسی و ڕووە ناشیرینەکەی جنس درا بە ئایین.. ئایین کاتی خۆی ئەوەندە پیرۆز بوو، ئەو کەسانەیش خەریکی کارو بانگەوازی ئایینی بون پیرۆز بون.. سێکس ئەوەندە بێڕێز و سووك بوو ئەوانیش لەسەر مەسەلەی

جنسیان بنوسیایه له‌ناو کۆمه‌ڵدا به‌چاوێکی سووك و بێ نرخ سه‌یر ئه‌کران..

به‌ڵام دواجار هه‌ر ئه‌م کۆمه‌ڵگایه ئه‌و ڕێزو نرخه‌یان له‌به‌ری کۆمه‌ڵی یه‌که‌م داکه‌ندو کردیانه به‌ری ئه‌مانه‌وه.

به‌هه‌شت گیان هۆی سه‌ره‌کی سه‌رنه‌که‌وتنی پیاوانی ئایینی مه‌سیحی له بانگه‌وازه‌که‌یاندا ئه‌وه بوو.. ئه‌وه‌ی له خه‌ڵکیان داوا ئه‌کرد خۆیان نه‌یان ئه‌کرد.. ئه‌و هه‌موو خۆپیشاندانه‌ی خۆیان پێ ئه‌نواند، که گوایه داوێن پاکن و دوورن له مه‌سه‌له‌ی جنسی (حه‌ڵاڵ و حه‌رام) و بێز له ئافره‌ت ئه‌که‌نه‌وه، که‌چی له کرده‌وه‌ی ژێرییاندا به‌و شێوه‌یه نه‌بون با گوێ له چیرۆکنووسی ئیتاڵی (بۆکاشیۆ ١٣١٣. ١٣٧٥ی زایینی) بگرین که چیرۆکه‌کانی بریتی بوو له ڕه‌نگدانه‌وه‌ی چۆنێتی ژیانی ئه‌و کاته‌ی ئه‌وروپا به‌گشتی و ئیتاڵیـان به‌تایبه‌تی و بـاس و ڕازو نیـازی هه‌موو چینه جۆربه‌جۆره‌کانی کۆمه‌ڵگای ئه‌و کتێبه‌دا ئه‌ڵێ (پیاوێك وێڵی داوێن پاکی بوو بوو له ئه‌وروپای ئه‌و کاته‌دا بیری له‌وه کرده‌وه که بڕوات بۆ شاری (ڕۆما) ڕه‌نگه به‌هۆی زۆری پاپاو پیاوانی ئایینی مه‌سیحی و زۆری ئامۆژگاری ئایینی له‌و شاره‌دا ڕێژه‌ی به‌ره‌ڵلایی و داوێن پیسی که‌م بوو بێته‌وه و ڕه‌وشتی تێدا مابێ.. ئه‌و پیاوه هه‌ژاره به‌و هه‌موو هیوایه‌وه هات بۆ ڕۆما.. به‌ڵام که

هات چی دی..بیستی (ڕۆما) لە هەموو جێگایەك زیاتر پەرپووتەو هەتا بینە قاقای لە لیتەی داوێن پیسیدا چەقیوە.. لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو، پیاوانی ئایینی هەر لە پاپاو زاناکانی تری مەسیحی زیاتر لە خەڵکی ڕەشۆکی هەتا بناگوێیان لە داوێن پیسیدا تێ ناوە، .بۆکاشیۆ ئەڵێ (ئەم پێشەوا ئایینیانە تەنیا بە مێبازی و ڕابواردن لەگەڵ ئافرەتدا نەوەستان بەڵکو هەتیوبازی و نێربازی و لەکاری جنسی نائاسایی درێغییان نەبوو.. بۆ ئەوەی شەرمێك لە خواو پۆیەك لە پلەوپایەی ئایینی و کۆیەك لە پرسینەوەی ویژدان بکەن..).

بەهەشت گیان پاپاکانی ڕۆما لە پلەیەکی بەرزان و لە دڵی گاورەکانی جیهاندا جێگایەکی تایبەتیان هەیە.. ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی ترەوە خاوەنی ئەم نوسینە ئەورووپی و لە خۆیانە، سەرەڕای ئەمانەیش ئەم نووسینە نووسینی کاتی سەردەمی ڕاپەڕین (عصر النهضة) نیە هەتا بڵێین داخ لە دڵی کەنیسە بووە. بەڵکو نووسینی کاتی ئەوپەڕی دەسەڵاتی مەسیحییە لە ئەورووپادا.

**بەهەشت:** کاکە گیان وابزانم یەکێك لە هۆکانی هەڵگیرساندنی شۆڕشە ئایینیەکەی (مارتن لوثەر) ئەم هەڵوێستە نامەردانەی پاپاکانی ڕۆما بوو..؟

نەوڕەسـ ــــی: لــوثهر ( Luther) خواپەرسـت و ڕاسـت و چارەسەرکەرو دڵسۆزی ئاینی مەسیحی بوو، کاتێ سەیری لاری و بێڕەوشتی پیاوانی کەنیسەی کرد و هەر لە بێڕەوشتی و ڕۆچوونیان لە داوێن پیسیدا هەتا فرۆشتنی بەهەشت و چەکی لێبوردن (صكوك الغفران)و.. هتد

لۆسهر سەیری کرد ئاینەکەی بەرەو مەترسی ئەڕوات و خواپەرستی ئەگەر لەهەر جێگایەکی تر هەبێ لای پاپاکان نییە، بۆیە ئەو شۆڕشە پیرۆزەی دروست کردو هەندێ سمارتەی دا لە یاساکانی کەنیسەو بە تەوراسی پێنوسە بڕندەکەی پەل و پۆی پاپاکان و قۆڵە درێژەکانیانی قرتاند.

ئەمە بوو بەکورتی هۆی بەرگە نەگرتنی ئاینی مەسیحی و دەستەوسانی لەبەرامبەر ئەو لێشاوە بەرەڵاییەی ئەورووپا، یان ڕاستتر بڵێین: ئەو دەستە ئەژنۆ دانیشتنەی کەنیسیە بەرامبەر بە پیلانە نادیارەکانی کەنیسەی جوولەکە..

**فرۆید هەڵەیە :**

**بەهەشت:** باشە ئەگەر واز لە باس کردنە مێژووییەکەی بهێنین و بێنە سەر ڕاکانی فرۆید و جنس پێچکردنی مرۆڤ لەلایەن فرۆیدەوە، تۆ ڕات چییە و؟ دواجار چارەسەری ئیسلامی چۆنە..؟

**نەوڕەسی:** بەڵێ جنس بەشێکی زۆر گرنگە لە ژیانی مرۆڤ (بەڵکو هەموو گیانداران) و ئێمەی موسڵمان نە بێئاگاین لە پیلانەکانی دوژمنانی ڕەوشت نە بێئاگایشین لە هەڵپەو بڵێسەی گڕی ئەو شۆڕشە جنسییەی سەرانسەری جیهانی ئادەمیزادی گرتۆتەوە. (جیمس رۆستۆن) زۆر ڕاستی وتووە کە لە ڕۆژنامەی (نێویورك تایمز)دا، نووسیبووی (.. ڕەنگە مەترسی تەقینەوەی وزەی جنسی گەلێ بەهێزترو گەورەتر بێ لە مەترسی تەقینەوەی وزەی ئەتۆمی..)[٧٦]

وە نەبێ ئێمەی موسڵمان، ئەمڕۆ ئەم مەترسییەمان زانیبێ و پێمان وترابێ، مامۆستای ژیانمان و پێشەواکەمان ﷺ ئەفەرمووێ (.. وما تشيع الفاحشة في قوم إلا عمهم الله بالبلاء..) واتە: شەپۆڵ پیسی و بەد ڕەوشتی لەناو هیچ نەتەوەیەکدا

---

[٧٦] – الأسلام والجنس، ص١٠.

بڵاونابێتەوە هەتا خوا هەموو (چاك و خراپ)یان تووشی بەلاو تەنگ و چەڵەمەی ژیان نەكات.

ئێمە چاك لە مەترسی جنسی شارەزاین و بۆیە ئایینەكەمان ئەم پەڕو ئەوپەڕی دیاری كردووەو تاقانەترین چارەسەری بۆ داناوە.. بەلام پێش ئەوەی ئەم چارەسەرەت بۆ باس بكەم پێویستە بە مام فرۆید بڵێین تۆ لە مەسەلەی جنسدا و لەسەر حیسابی شەرەف و نامووسی ئادەمیزادان زۆر پێت ڕاكێشاوەو پێویستە قاچت ببڕێتەوە چونكە:

١. وەكو كاكە صباح (ی خۆمان) ئەڵێ (فرۆید ئەیەوێت هەموو پەیوەندییەكی ئینسانانە بفەوتێنێ و مرۆڤ لە گشت بەزەیی و پاكییەك ڕووت بكاتەوە، ئەو مرۆڤەی كە سەردار و گەورەی ژیان و جیهانە، ئەو مرۆڤە كە هەرچی لە وجوددا هەیە بۆ خزمەت گوزاری ئەو دروستكراون و خۆشی لە جوانترین فۆرم و ناوەڕۆك دروست بووە)[77].

٢. وە ئەڵێ (فرۆید ئەیەوێ سەربەستی بەرەڵایی جنسی و دوژمنایەتی لەناو ئادەمی دا بلاویكاتەوە ویست و مەرامێتی شارستانیەت بەردەوام بونی كاروانی ژیان بوەستێنێ، ئەوەش نەك هەر لە توانای و ڕۆشنبیرێتی و كەلەپوری لەمێژینەی

---

[77]– ئافرەت لە چیرۆكی كوردیدا، ل٢٧٥.

مرۆڤایەتی بەدرۆ بخاتەوەو ئەودا نییە، بەڵکو تۆزقالێکیش لە کێوی ورەی خەڵکی و بەخۆشی پێکەوە ژیان، کەم ناکاتەوە. سێکس لە ژیاندا، چ وەك ئامانج، شتێکی پیرۆز و پاکە نکوڵی لەوە ناکرێ کە بەهۆی ئەوەوەیە وەچەو و میراتی جۆری ئادەمی دەپارێزرێ و هۆیەکی هەرە گرنگ و پێویستە بۆ دڵنیایی دەروون و هێمنی دڵ و ئارام گرتنی ویژدان، ئەمە لەکاتێکدا دروست دەبێ کە ئەو چەشنی جنسە لەسەر بنچینەی ژن و مێردایەتییەکی دروست دابمەزرێ .

دەنا کە بە بەرەڵلایی و بێ یاسا بوو لەبری هەموو ئەو چاکانە بەباری خراپیدا قلپ دەبێتەوەو مرۆڤ تووشی، سەرگەردانی دەکات و نرخی ڕاستەقینەی بزر دەبێ.

جنس لە مرۆڤدا ئینسانانەیەو پەیامێکی مەزنە، تەنیا لەبەر زاووزێ نییە، لەپێناوی خۆشەویستی و چێژو بەختیاری مرۆڤایەتیدایە، کەواتە لێرەدا دەبێ ئەوە بە نەزەر وەربگیرێ کە نەچێتە سنوری کاری ئاژەڵایەتی و داوێن پیسییەوە)[78].

٢. بەهەشت گیان پرسیار لە فرۆیدی (ڕەحمەتی)یان بکەن و بڵێن ئەگەر کوڕ بە پاڵەپەستۆیەکی جنسی و ڕابواردنی جنسی لەگەڵ دایکیدا مەمکی ئەمژێ..؟ ئەی کچ بۆچی ئەیمژێ..؟

---

[78]- هەمان سەرچاوەو ل٢٧٥-٢٧٦.

(ئەبوایە کچەکانی ئەوان هەر لە منالییەوە شوێنێکی تری باوکیان بمژیایە بۆ ئەوەی تاسەی جنسایەتییان پێ بشکاندایە.. یان بۆچی پرسیار لە فرۆیدیزمییەکان ناکەن و بڵێن.. وا کچ بە هەواو نەزمی جنسی و چاو لەوەڕاندنەوە یاری لەگەڵ باوکی ئەکات (وەکو فرۆید ئەڵێ)و بە دەمی باوکییەوە پێئەکەنێ و باوەشی پێدا ئەکات.. ئەی کوڕەکە بە چ نیازێکەوە ئەشنێتەوە بەدەم باوکییەوە ئەقلێتەوەو پێئەکەنێ بۆی...؟

٤. فرۆید، زۆر هەڵەیە کە لای وایە شارستانێتی ئادەمیزاد و هونەرو ئایینەکان و.. هتد

هەموویان ڕەنگدانەوەی جنسن و پاڵەپەستۆیەکی سێکس ئاژەڵێتی مرۆڤ یەقی کردۆتەوە، چونکە دڵداری جنسی یەك جۆرە گرێ دەروونییەکانی (ئۆدیب) و (ئەلیکترا) یەك گرێ کوێرەیە.. خەفەکردن یەك جۆرەو ئەنجامی کپ کردنەوەی وزەی جنسی یەك جۆرە.. هەموو ئەمانە لای هەموو ئادەمیزادانی سەرانسەری زەوی و سەرانسەری مێژوو یەك جۆرە.. ئەی چۆن ئەم جۆرە شارستانێتیە جۆراو جۆرە جیاوازانە دروست بون..؟ بۆچی ئەم هەموو یاسا کۆمەڵایەتیە جیاواز لە یەکتری و دژی یەکترییە دروست بون..؟ بۆچی ئەم هەموو جموجووڵەی مێژوو جیاجیایە دروست بون..؟ هەر لەناو ئایینەکاندا ئەو هەموو

ڕێباز (مذاهب)ە، جیا جیایانە دروست بون..؟ خۆ ئەگەر هونەر (فن) لە قووت دانەوەی هانای جنسییەوە دروست بووە، ئەم هەموو جۆرە هونەرە جیاجیاو قوتابخانە جیاجیایەی هونەرییە چین..؟ بۆچی ئەبێ ڕێبازی هونەرمەندێك جیاوازی بێ لەگەڵ هونەرمەندێکی تردا.

کە هەردووکیان یەك نەخۆشییان هەیە..؟ لیۆناردۆ دافینشی[79] (Leounardo davinci)ـ کە فرۆید کالایەکی جنسی کردۆتە بالای خۆی و هونەرەکەی - بۆچی وێنەکێش دەرچوو..؟ بۆچی مۆسیقاژەن نەبوو..؟ ئەی بۆچی ئەوانەی تووشی ئەو نەخۆشییە جنسییەی (دافینشی) ئەبن، بۆچی وێنەکێش دەرناچن..؟ خۆ بەپێی مەن و پێوانەکەی فرۆید ئەبووایە یەك جۆرە شارستانێتی و یەك جۆرە یاسای کۆمەلایەتی و ئایین و هونەر و هتد.. پەیدا بووایە کەچی وا نیە..[80].

---

[79]– دافینشی: وێنەکێشێکی جیهانییەو سالی ١٤٥٢ی زایینی لە ئیتالیا لەدایك بووەو یەکێك بوو لە هەلکەوتووانی چەرخی ڕاپەڕین (جۆکۆندا) بەناوبانگترین تابلۆیەتی کە ئێستا لە مۆزەخانەی (لۆڤەر)ی فەرەنسادایە.

[80]– دراسات في النفس الأنسانية، ص٣٦٨.

بەهەشت: کاکە گیان ناوی (دافینشی)یت هێناو وتت گوایا فرۆید کالآیەکی جنسی کردۆتە بالآی خۆی و هونەرەکەی.. مەبەستت چییە..؟

نەوڕەسی: بەڵێ بەهەشت گیان کاتێ فرۆید باسی هونەرمەندی لیۆناردۆ دافینشی ئەکات و شیئەکاتەوە چۆن دافینشی لەگەڵ هونەرمەندییەکەیدا زانایەکی بەرزبووە ئەڵێ (.. چونکە . دافینشی . منداڵێکی هەتیوی بێ باوك بوو زۆر حەزی لە دایکی خۆی ئەکردو ئەم ئەوینی دایکەی بووە هۆی زوو وەڕسی چالاکی جنسی... ئەم چالاکییەش بووە هۆی تەقینەوەی چالاکی هونەری... زانایییەکەیشی هۆی ئەوەیە چونکە بە منداڵی زۆر حەزی لە توێژینەوەی مەسەلە جنسییەکان ئەکرد.. ئەمەیش بووە هۆی تەقینەوەی چالاکی و سەرنجدانە سروشت و دیاردەکانی سروشت..)[٨١].

٥. بەهەشت گیان گەورەترین هۆی چەواشە کردن و ڕێ لێ تێکچوونی ئەمانە ئەوەیە، مرۆڤ بە گیاندارێك وەکو هەموو گیاندارە ئاژەڵییەکەی تر سەیر ئەکەن و بە هەمان سەنگ و تەرازوو ئەیکێشن، جارجار پارسەنکێشی ئەنێن. ئیتر نازانن ئەم مرۆڤە وەکو تۆپەڵەیەکی ماددییە هەروەها وزەیەکی گیان و

[٨١]- پاڤلوڤ و فروید، ج٢، ص٢٤.

دەروونەو تەنیا ماددە نییە. بەڵێ لە مەسەلی جنسدا مرۆڤ وەکو هەموو ئاژەڵ و گیانداریك غەریزەی جنسی تێدایە، بەڵام نەك وەکو هەموو گیانداریك.. چونکە گیاندارەکانی ترلە بەرامبەر غەریزەکانیان (غەریزەی خواردن و خواردنەوەو جنسی و هتد..) شەتەك دراوەو هیچ جۆرە دەسەڵات و هێزی پەل هاویشتنی نییەو کاتێ برسی بوو خواردن ئامادە بوو ناتوانێ نەیخوات، تینووی بوو، ئاوی دەست کەوت ناتوانێ نەیخواتەوەو بۆ جنسیش هەروەها.

جا لەبەرئەوەی گیاندارەکانی تر هۆش و دەسەڵاتی سنووردانانیان نییە..خوای گەورە کاتی تایبەتی و وەرزی تایبەتی بۆ داناون، بۆ هەڵسان بە کاری جنسیان و بۆ مانەوەی وەچەو نەوەی تازە، کاتێ وەرزەکەیان بەسەر چوو هیچ شێوە پەیوەندییەکی جنسی لەنێوان نێرو مێیەکانیاندا نامێنێ[82]..

بەڵام مرۆڤ هەموو کاتێ هەرەتی جنسییەتی و وەرزی دیاری کراوی نیە، تەنیا ئەوەندە هەیە گیاندارێکی جنسی ڕووت نیە، پەژارەی تەنیا جنسی بێ بەڵکو سنوورو یاساو باوێکی بۆ دانراوە پەیڕەوی ئەکات.

---

[82]– الأنسان بين المادية والأسلام، ص٩٤.

٦. ئەگەر مرۆڤ لەسەر نەخشەی فرۆید و فرۆیدیزم پەروەردە بکرێ و هەموو هیواو ئاوات و ژیانی جنسی و سێکسبازی بێ.. مرۆڤێکی خۆپەرست و تەنیا بۆ خۆی ئەژی و گوێی لە ناڵەی کۆمەڵ و دەردەکانی و لێقەوماوی گەلەکەیەوە نیە، ناتوانێ دەست لە ڕابواردنەی هەڵگرێ بۆ بەرژەوەندی وڵات و کۆمەڵەکەی ئەوەش هۆی سەرەکی بوو، فەرەنسییەکان لە یەکەم لێدانی ئەڵمانەدا چۆکیان دادا و قیژەی خۆبەدەستەوەدانیان و کارگوزاری دوژمن و ئامادەبونیان بە ژیانی کۆیلێتی لێ بەرزبوویەوە و داوای یارمەتییان ئەکرد، پەژارەو خەفەتیان بۆ لەدەست دەرچوون و ژێر دەستی وڵاتەکەیان نەبوو، بەڵکو خەفەتی کاول بونی سەماگا (مرقص)و باڕو سۆزانی خانەکانیان بوو..

٧. کاک میراودەلی، لە . ئیستاتیکا ـ کەیدا ئەڵێ (٣٢) (گەرچی فرۆید لە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە دەروونییەکانیدا وا دەردەکەوێ کە ڕێبازێکی . تجریبی ـ زانستی گرتۆتە بەر، واتە دەیەوێ (گریمان)ەکەی لە ڕێگای تاقیکردنەوەو ئەزموونەوە بسەلمێنێت. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ئەمە هەر لەڕووی ڕوخسارەوەیەو، تاقیکردنەوە و بەڵگەکانی ئەو تەنیا بۆ (تبریر) کردن بەهانە دۆزینەوە، بۆ ئەو گریمانە هەوەڵیەیە، کە

پێشکه‌شی کردووه..) وه ئه‌ڵێ (جگه له‌مه‌ش فرۆید که‌وتۆته هه‌ڵه‌یه‌کی زانستی گه‌وره‌وه، کاتێ هه‌وه‌ڵێتی ده‌دات به سایکۆلۆژی له دیاری کردنی ڕه‌وتی شارستانیه‌ت و سیستمی کۆمه‌لایه‌تی و پێوانه‌ی ڕه‌وشتی و یاسا و ڕێوڕه‌سمی باودا.. دیاره ئه‌مانه له ئه‌نجامی . دامرکاندنی غه‌ریزه‌وه. کبت . نایه‌ن، وه‌ك شیکردنه‌وه‌ی ده‌روونی ده‌ڵێت.. به‌ڵکو به پێچه‌وانه‌وه یاسا و سیستم و ڕێوڕه‌سمی کۆمه‌لایه‌تین که ده‌بنه هۆی . دامرکاندن . چونکه یه‌که‌م جار ئه‌و ژێرخانه دروست ده‌بێت که به‌رژه‌وه‌ندی سیاسی و ئابووری چینه جیاوازه‌کان . به‌ڕای کاك کمال . ڕاستتر بڵێین مارکسیزم . ده‌رده‌بڕێت، ئینجا ئه‌و یاساو ڕێوڕه‌سمانه دروست ده‌بن..)[٨٣].

٨. هه‌موو ئه‌و نه‌خۆشی و دواکه‌وتن و کۆسپانه‌ی کۆمه‌ڵ فرۆید ئه‌یداته ده‌ستی کپ کردنی جنس و خه‌فه‌کردنی و ئه‌ڵێت: ئه‌گه‌ر جنس سه‌رکوت نه‌کرێت و هه‌ر کوڕ و کچه‌ی به ئاره‌زووی خۆیان و له کوێ حه‌ز ئه‌که‌ن برسێتییان بشکێنن و (کۆت)ه‌کانی ئایین و ڕه‌وشت و یاسا هیچ قه‌ده‌غه‌گه‌رییه‌ك نه‌که‌ن، ئیتر جیهانێکی به‌هه‌شتین له‌سه‌ر زه‌ویدا دروست ئه‌بێ و نه‌جه‌نگ و داوا نه نائارامی دڵ و ده‌روون و نه نه‌خۆشی ده‌روونی، ئه‌مانه هیچیان

[٨٣]- هه‌مان سه‌رچاوه‌ی ل٣٢٤.

نامێنن، چونکە ئەمانە هەمووی هۆی خەفەکردن و سەرکوت کردنی جنسە.

ئێمە هیچیان پێ ناڵێین، بەڵام با ئەوان خۆیان گوێ لە هانای جنس پەرستان و جڵەو شلکەرانی جنسی بگرن (نەك لای خۆمانی دواکەوتوو بەڵکو لە ئەوروپاو ئەمەریکا با بزانن، ئایا دوای ئەوەی سنووری نێوان مرۆڤ و ئاژەڵیان شکاند، توانیان بەهەشتە ئایدیالییە (علمی)یەکەیان دروست بکەن؟ توانیان . نەك کێشەکانی تری کۆمەڵ بەڵکو تەنیا- کێشەی جنس - خۆی . چارەسەر بکەن..؟

أ. زەقترین دەنگ و باس و هانای گۆڤارە ڕۆژنامەکانی ئەمەریکا ئەوەیە کە (هەموو ڕۆژێك سەدان کوڕ سەدان کچ بە ئۆتۆمبیلەکەی ئەفرێنێ و بەزۆر لە چۆڵەوانییەکدا برسێتی جنسی خۆی پێ ئەشکێنێ و بەجێی ئەهێڵێ.. کچە هەژارەکە بەهەر حاڵێك بێ، شەو درەنگێك یان خۆی ئەگەیەنێتە خەستەخانە، یان ماڵەوەو..)[٨٤] ئەم دیاردەیە چییە..؟ خۆ کۆمەڵگای ئەمەریکی (پێشکەوتوو) ئەوپەڕی سەربەستی جنسیان دراوەتێ ئەی بۆچی ئەم تابلۆ ناهەموارانە ڕۆژی دەیان جار دووپات ئەبێتەوە..؟

---

[٨٤]- الأنسان بين المادية والاسلام، ص١٤٥.

هۆی ئەوەیە، کاتێ بەناوی دوورە پەرێزی لە خەفەکردنی جنسی و مرۆڤ کرا بە ئاژەڵ و ڕەشۆی لەسەر داماڵراو هیچ یاساو باوەڕو ترسێکی نەبوو، ئا لەم کاتەدا زۆر جار کوڕێك حەزی لە کچێکەو کچەکەش دڵی ناچێتە سەری و ڕووی ناداتێ لە ژێر پەردەی سەربەستی جنسیدا بەزۆر ئەیفڕێنێ و پاش تێکشکاندن و ژاکاندنی لەو دەشتە چۆڵە بەجێی ئەهێڵێ..

وا (ڕادووکەوتن = ئافرەت هەڵگرتنەکەی لای ئێمە) بە حەزی کوڕو کچەکە هەردووکیان و لە ئەنجامی دووری باوکەکان و کۆمەڵگاکەمان لە گیانی خاوێنی ئایینە پیرۆزەکەمانەوەو نەریتی عەشایەری هەموو مافێکی ناڕەوای پێش هاتنی ئیسلامی بۆ باوکە نەزانەکە زیندوو کردۆتەوە و ژیان و مردن و دڵی کچەکەیشیان داوەتە دەستی باوکەکە ئەمانە ئەبنە هۆی پەیدابونی تاقە (ڕەدووکەوتن) بەلام پێم نالێن ئایا ئەو سەربەستیە جنسیە بێتام و مەزەی ئەمریکییە توانیویێتی کێشەی جنسی ئەمریکی چارەسەر بکات..؟

ب. با لە ئەمەریکاوە بڕۆین بۆ (سوید) بەڵێ (سوید) پایتەختی سەربەستی جنسی، لەو سویدە پێشکەوتووە دوورە لە هەموو کۆت و نەریت و ئایینێك.. ساڵی ١٩٦٤ گاڵەگاڵێکی گەورە دروست بوو، چونکە (١٤٠ سەدو چل) پزیشك لە کەڵە

پزیشکەکانی سوید یادنامەیەکیان بە بارەگای پاشای سوید پێشەکەش کردو لە یادنامەکەیاندا داوایان کردبوو کە سنوورێك بۆ ئەم ئاشووبە بەرەڵلا جنسییە لە وڵاتدا دابنرێت ئەگینا تەندروستی گەلی سوید ئەکەوێتە مەترسییەکی سامناکەوە[85].

هەمان سکاڵا و هاوار لە وڵاتی ئینگلیز و پۆڵەندە و ئەڵمانی ڕۆژئاوا بەرزبوویەوە.. خۆ وڵاتانی چین و ڕوسیا زووتفاقی ئەم مەترسییەیان خستبوو.

ج. کێ هەیە هاوار و بانگهێشتەکەی سەرۆکی ناوداری ئەمەریکی (کەنەدی) کە لە کتێب و ڕۆژنامەو ئۆرگان و ئیزگەکاندا بڵاوی کردەوە نەیبیستێ کە لە ساڵی ١٩٦٢دا بڵاوی کردەوەو وتی (پاشەڕۆژی ئەمەریکا لە مەترسیدایە، چونکە لاوانی ئەمریکی تواونەتەوە لە زۆنگاو و زەلکاوی شەهوەتداو ناتوانن بەرپرسیاری خۆیان بەرامبەر نیشتمانەکەیان بەجێ بهێنن و هەست بە لێپرسینەوەو ئەرکی سەرشانی خۆیان ناکەن و.. هەر لە حەوت لاوی ئەمەریکی بانگ ئەکرێت بۆ سەربازی شەشیان بە کەڵك نایەن و چونکە بە شێوەیەکی پڕ مەترسی

---

[85]– الأسلام و الجنس، ص١٤ وە کتێبی لە دەروازەی ئیسلامەوە ل٩٧.

ڕۆچوون لە جنسدا کە لێهاتوویی لاشەیی و بەدەنی و دەروونی بەرباد کردوون و بە کەڵکی سەربازی نەهێشتوون[٨٦].

د۔ ئەگەر فرۆید ڕاستی بکردایەو بە نەمانی کۆتە جنسییەکان ئەبووایە تاوان و دەست درێژی بۆ یەکتری و دزێتی نەمایە، کەچی ئەو جۆرە تاوانەی لە ئەوروپاو ئەمەریکا ئەکرێت، پێش داگیرکردنی (ئامێرەکانی ڕاگەیاندنی) وڵاتەکانی ئێمە هەر ناویشمان نەبیستبوو.

هـ. بەهەشت گیان پرسیار بکەن لە ئەوروپاو هەموو وڵات و گەلە بەرەڵڵاکانی تر و بزانن ئایا لەگەڵ ئەو هەموو سەربەستی جنسییە و داماڵینی کۆت و زنجیری . وەکو ئەڵێن ۔ کچ و کوڕە؟ ئایا برسێتی جنسییان شکا.. زەقترین دیاردەی ئەوروپا و ئەمەریکا جنس و کاری جنسی و پڕوپاگەندەیە بۆ جنس، بە هەزاران فیلمی جنسی.. بە هەزاران چیرۆکی جنسی.. بە هەزاران وێنەی ڕووت و قوتی جنسی.. بە هەزاران بەرنامەی ئێزگەو تەلەفزیۆنی جنسی.. بە هەزاران کاسێتی ڤیدیۆی جنسی.. بە هەزاران گۆرانی و ئاهەنگی شەوانی تا بەیانی و تێرژانی جنسی.. ئایا لاوە چاوبرسی و جنس پەرستەکانی ئەوروپاو

---

[٨٦]- الثورة الجنسية، جۆرج بالۆش، لە کتێبی الاسلام و الجنس، ص١٥.

ئه‌مه‌ریکای تێر کرد؟ یان له‌وێ زیاتر کڵپه و بڵێسه‌ی جنس سووتێنه‌رتر نه‌بووه..؟

١٠. خه‌فه‌کردنی جنسی  . تا ڕاده‌یه‌کی زۆر ـ ئه‌بێته هۆی ته‌قینه‌وه‌ی وزه‌ی لێهاتن و مژده‌ی لێهاتوویی مرۆڤه‌که‌ ئه‌دا، ئه‌بێته هۆی بزواندنی که‌سایه‌تی ئه‌و مرۆڤه . فرۆید خۆیشی ددان به‌م ڕاستیه‌دا ده‌نێ.[٨٧] کاتێك منالێك وڕك له باوکی ئه‌گرێت و ئه‌ڵێ (بابه گیان حه‌زم له‌و مانگه جوانه‌یه به‌و ئاسمانه‌وه‌یه حه‌ز ئه‌که‌م بۆم دابگری..) دیارییه ئه‌م حه‌زه خه‌فه ئه‌بێ و نایه‌ته جێ، به‌لاّم ئه‌زانی ئه‌م خه‌فه‌کردنه له پاشه‌ڕۆژدا ئه‌بێته بزواندنی و ته‌قینه‌وه‌ی وزه‌ی هونه‌ری له مێشك و بیره‌وه‌ری ئه‌و مناڵه‌دا.

١١. مرۆڤ زۆرجار ئه‌و تام و مه‌زه‌ی له خه‌فه‌کردن ئه‌یچێژێ له‌سه‌ربه‌ستی دا نایچێژێ و ده‌ستی ناکه‌وێ.. ئه‌و موسڵمانه ڕۆژووانه‌ی برسێتی و تینوێتی و هه‌ر خواردن و خواردنه‌وه‌یه‌کیش حه‌زی لێ ئه‌کات ئاماده‌یه.. ئه‌م به‌ڕۆژووه‌و حه‌زه‌کانی خه‌فه ئه‌کات و سه‌رکوتی ئه‌کات، به‌لاّم ئه‌و تام و مه‌زه‌ی له برسێتی و تینوێتی و خه‌فه‌کردنی حه‌زه‌که‌یدا هه‌ستی پێ ئه‌کات و ئه‌یچێژێ له خواردن و خواردنه‌وه‌که‌دا نایچێژێ.. هه‌ر له‌به‌ر ئه‌م هه‌سته پڕ مه‌زه‌یه سه‌یر ئه‌که‌ین هه‌موو کاتێك و

[٨٧]– الأنسان بين المادية والاسلام، ص١١١.

(لەسەرانسەری مێژوودا) ڕێژەی ڕووژووەوان زیاترە لە نوێژگەران.. لەگەڵ ئەم هەموو ماندوێتی و تینوێتی و لەش داهێزان و سەرئێشەیدا مرۆڤ لە ڕۆژوودا تووشی ئەبێ کەچی هەر ڕووژووان زیاترن لە نوێژگەران.. چونکە ئەوەی فرۆید پێی ئەڵێ خەفەکردن و سەرکوت کردن (الکبت) ئێمە پێی ئەڵێین (خۆگرتن و ئاگاداری کردن و بێدار کردنەوەی دەروون) و هەرگیز بەهێزێکی دوور لە مرۆڤ و بێگانە لە مرۆڤ و سەپێنراو بەسەر مرۆڤدا سەیری ناکەین (وەکو فرۆید لای وایە)[88] بەڵکو بەشێکە لە مرۆڤ و ئامێرێکی بایۆلۆجی ڕووتەو ئەبێتە هۆی پەیدابون و کارگێڕی چەند ئامێرێکی تری سایکۆلۆجی.

خۆگرتن (الضبط النفس) وەرزشێکی دەروونییەو ئەبێتە هۆی پەروەرەو (دارەدارە) بە مرۆڤ ئەکات بۆ ئەوەی پێبگرێت و لە سارای ژیاندا بە سکەخشێ نەڕوات، جا پاش ئەوەی پێی گرت ئەو کاتە نرخی ئەو هەڵسوکەوتن و سەرسمدان و نووچ بردنە ئەزانێ و ئەو کاتە بەرهەمەکەی ئەچێژێ.

خۆ گرتنیش تام و مەزەیەکی هەیە کەسێ نەیچەشتبێ نایزانێ.

---

[88]– دراسات في النفس الأنسانية، ص١٧٤.

١٢. زۆرجار ئەو تام و حەزەی لە ئازارو ئەشکەنجەی ڕێگای بیروباوەڕداو لە بەندیخانەو لە سەنگەرو.. هتد.. دا هەیە لە ئازادی و سەربەستی ژێر چەپۆکەی (کوونیی و سەلامەتی)دا نییە.

١٣. ئەگەر سەیری لاپەڕەکانی مێژووی کۆن و نوێ بکەین، بە سەدان شارستانی بەدی ئەکەین بەهۆی ڕۆچوونی ئەندامانی کۆمەڵگاکەیەوە لەناوچووە و تەخت و تاراجی نەماوەو بونەتە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئێمەو بۆ نەوەی داهاتوو. وەکو لە دواییداو لە بەشی (ڕەوشت لە ڕوانگەی فرۆیدەوە) بە پشتیوانی خوا باسی ئەکەین.

١٤. ئەگەر سەرژمێرەی نەخۆشی دەروونی و شێت و هەستریا- دارەکانی وڵاتە ئیسلامییەکان و وڵاتانی ئەوروپا بکرێت ڕەنگە وڵاتە موسڵمانەکان لەچاو ئەورووپاو ئەمەریکادا هیچ دیاردەیەکی نەخۆشی دەروونی تێدا بەدی نەکرێت. یان هەر بەراورد ناکرێت جا ئەگەر خەفەکردنی جنس هۆی نەخۆشییەکانی دەروونی بێ لە کام وڵاتانیان خەفەکردنی جنسی زۆرترە؟. بەپێی وتەی فرۆید ئەبووایە لاوەکانی ئەورووپا لەوپەڕی دڵ و دڵنیاییدا بژینایە، کەچی بە پێچەوانەوە هەریەکە لەو (سەربەستانە!) پزیشکێکی تایبەتی دەروونی هەیەو چەند جۆرە ڕاچێتە و

تیشك (اشعه)ی ڕەنگاو ڕەنگ و بێ ڕەنگ لەناو جانتاکەیدایە و بۆ ئەوەی لە خۆکوشتنەوە ڕزگاری ببێ.

بەهەشت: وا کچە سەرلێشێواوە پەتیارەکانی لای ئێمەشیان فێری ئەم (مۆدێل)ە کرد.. خۆسوتاندن.. خۆکوشتن.. دەرمان خواردکردن..

نەورەسی: بەڵێ ئەوەیش دەس و دیاری شارستانێتی ڕۆژئاوای داگیرکەرانی فیکری ولاتەکانمانە ئەگینا پێش هاتنی ئەوان ئەم دیاردەیە لە کوردستاندا نەبوو[٨٩].

١٥. پاڵەپەستۆی ئارەزووکاری و غەریزەکانی مرۆڤ وەکو دەفرە پێچاو پێچە هاوێتەکان (الأواني المستطرقة) وایە، هەر دەفرێکیان کون بکرێت ڕێژەی شلەکە لە هەموویان وەکو یەك دێتە خوارەوەو لە ڕێژەی ئەو دەفرەکانی تر کەم ئەکاتەوە.. هەروەها غەریزەو پاڵەپەستۆو ئارەزووکارییەکان ئەبێ هەریەکەیان سنورێکی بۆ دابنرێت بۆ ئەوەی پێداویست و ئارەزووەکانی مرۆڤ هەریەکەیان بە ئەندازەی خۆی و مافی خۆی بدرێتێ و ژیانی لاسەنگ نەبێ.

بەهەشت: کاکە گیان ئەوە فرۆید مەبەستی لە گرێی ئۆدیبی دەروونی چییەو (ئۆدیب) مانای چی..؟

---

[٨٩]- تحفه‌ء مظفرئه نۆسکارمان، هێمن موکریانی، ل٧٥.

نەوڕەسی: خوشكێ گیان مەبەستی فرۆید لە گرێی ئۆدیب (عقدة أوديب = Oedipus Complex).. منالْ لە سەرەتای ژیانی و چاو هەڵهێنانی بە ژیان و ڕۆشناییدا پێویستی بەوەیە سەربەستی دەربڕینی خۆشەویستی هەبێ بەرامبەر بەو شتانەی کە خۆشی ئەوێن..بەتایبەتی خۆشەویستی (دڵداری) بەرامبەر دایکی.. بەڵام کاتێ هەست پەیدا ئەکات و باوکی ئەناسێ و لە کەین و بەینی دایك و باوکی (وەکو ژن و مێرد) تێئەگات..

باوکی وەکو داگیرکەرێکی دایکی و کپکەرەوەی ئەو خۆشەویستییە (جنس)یەی منالەکە بۆ دایکی، باوکی بەدی ئەکات، بەناچاری کوڕەکە ئە وەهەستە کپ ئەکات و سۆزە جنسییەکەی خەفە ئەکات، بەم قۆناغە سایکۆلۆجییە ئەوترێ (عقده أوديب)[٩٠].

بەهەشت: جا فرۆید ئەم ناوەی لەکوێ هێناوە..؟

نەوڕەسی: ئەی من ناڵێم فرۆید هەموو تیۆرە زانیارییەکەی (!) لەسەر چیرۆکی پڕو پووچ و دوور لە واقیع و هەرگیز ڕوونەداو، داناوە... لە داستانە ئەفسانەییەکاندا ئەڵێ کوڕە پاشایەك ئەبێ و ناوی (ئۆدیب) ئەبێ.. کاتێ لەدایك ئەبێ لەلایەن خواکانەوە (خواکان..!) ئاگاداری باوکی ئەکەن کە (ئەم کوڕە لە پاشەڕۆژدا

---

[٩٠]- قاموس علم النفس، ص١٠٧-١٠٨.

باوکی ئەکوژێ و دایکی خۆی ئەبێتە ژنی)، باوکی ئۆدیبی دایە دەست شوانێکیان کە بیبات و بیکوژێت.. بەڵام شوانەکە دڵی بڕوایی نەدا بیکوژێ دایە دەست شوانێکی هاوڕێی کە ئەویش شوانکاری (پۆلیۆس) پاشای (کۆرنەشە) بوو.. پۆلیۆس پاشایەکی ئوجاخ کوێر بوو، کاتێ ئێوارە ئەم شوانە ئەم کوڕە جوانە ئەباتەوەو ئەیباتە دیوانی پاشا.. پاشا زۆری پێخۆش ئەبێ و وەکو کوڕە پاشا بەخێوی ئەکەن و لەلەیی ئەکەن هەتا کوڕە ئەگاتە هەرەتی هەرزەکاری و لاوێتی.. ئەپۆڵلۆ (Apolloh) . خوای ڕووناکی و هونەرو جوانی = لای یۆنانیەکان . بە ئۆدیب ڕادەگەیەنێ کە باوکی ئەکوژێ و دایکی دەکاتە خێزانی خۆی.. ئۆدیبیش لای وایە پۆلیۆس باوکێتی و شاژنەی کۆرنەشە دایکێتی.. لەبەرئەوە سەری خۆی هەڵئەگرێ و کۆرنەشە بەجێ ئەهێڵێ بۆ ئەوەی تووشی ئەو تاوانانە نەبێ (گوایا) لە ڕێگا تووشی بیرێك ئەبێ پیرە سواری گالیسکەیەك ئەبێ و لەبەرئەوەی ئۆدیب لە چەقی ڕێگاکەدا وەستاوەو ڕێگای گالیسکەکەی گرتووە قامچییەك ئەدا لە ئۆدیب بۆ ئەوەی لەسەر ڕێگاکە لاچێ.. ئۆدیب لەپڕ ڕائەچەنێ و پەلاماری پیرە ئەداو کوتەکێکی پێدا ئەداو لە جێگای خۆی خپی ئەکاو ئەیکوژێت تومەس ئەم پیرە باوکە ڕاستەقینەکەیەتی . بەپێی ئەفسانەکە پاش کوشتنی

باوکی ئەپرواتە شاری (ثیبە = طیبە) کە ئەو کاتە شارەکە بەدەستی دڕەندەیەکەوە تەنگی پێهەڵچنرا بوو...بۆیە دانیشتوانی شارەکە بڕیاریاندا بوو هەرکەسە ئەو دڕندەیە بکوژێ و شارەکە لە دەستی ئەو وەحشییە ڕزگار بکات ئەیکەن بە پادشای خۆیان و شاژنیشی لێ مارە ئەکەن.. ئۆدیب دڕندەکە ئەکوژێ و ئەیکەنە پاشای (طیبە) لە جێی باوکە کوژراوەکەی دایکیشی کە شاژنە (یۆکاستە)یە مارەی ئەکات.. بەڵام ئۆدیب نەی ئەزانی ئەو پیاوە کوژراوەکە باوکێتی و نەی ئەزانی خێزانەکەیشی دایکێتی.. کاتێ بۆی دەرئەکەوێ لە ڕق و داخ و خەفەتدا هەردوو چاوی خۆی هەڵئەکۆڵێ و بە کوێری پاشایی و وڵات بەجێ ئەهێڵێ و کچە تاقانەکەیشی (ئەنتیگۆن) ئەبێتە پەلکێشی و وڵات ئەگرنەبەر..).

فرۆید ناوی (ئۆدیب)ی لەم چیرۆکە ئەفسانەییە وەرگرتووە..

**بەهەشت:** جا کاکە گیان. ئۆدیب کەی حەزی لە دایکی کردووەو کەی زانیویێتی ئەوە دایکێتی کە مارەی کردووە.. تەنانەت هەستیشی بە هیچ جۆرە خزمایەتییەك نەئەکرد.. ئەوە لە لایەکەوە لە لایەکی ترەوە هیچ لە ڕووداوەکانی لە دەسەڵاتی ئۆدیبدا نەبون..[91].

---

[91]- ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا، ل٢٧٣.

نەوڕەسی: سەرەڕای ئەمانە، ئەم چیرۆکە ئەفسانەیە و ڕووی نەداوە (ئەپۆولۆ)ی چی و (خواکان)ی چی.. و ئەی بۆچی لە هەموو سەرانسەری مێژوودا ڕووداوێکی دیکەی بەو جۆرە ڕووی نەداوە..؟ کەچی بەهەشت گیان، فرۆید زۆر شانازیش بەم داهێنراوە زانیارییەو پێشکەوتنە ئەکات و لای وایە هیچی لە دۆزینەوەی کارەباو هێزی هەڵم کەمتر نییەو ئەڵێ (ئەگەر زانیاری دەروونناسی شانازی بکات بە هەر شتێکەوە ڕەوایە تەنیا شانازیی بە (عقده أوديب) و دۆزینەوەی ئەو گرێ دەروونییەوە بکات)[٩٢].

بەهەشت: کاکە گیان، وەکو تۆ فەرمووت هەموو بەڵگەکانی فرۆید لەسەر چیرۆکی پڕوپووچ و ئەفسانە دانراون بەڵام خۆ ئەگەر ئەم چیرۆك و بەسەرهاتەیش ڕاست بێ . نابێتە بەڵگەی خۆشەویستی _جنسی) منداڵ (کوڕ) بۆ دایکی، چونکە ئۆدیب جگە لە (یۆلیۆس)ی پاشای (کۆدنەشە)و ژنەکەی کەسی دیکەی بە دایك و باوکی خۆی نەزانیوە.. ئەم هۆیەش بوو ئۆدیبی ئاوارە کردو کۆڕنەشەی بەجێهێشت.

نەوڕەسی: زۆر ڕاستە، ئەوە بوو پاش زانینی (وەکو ئەفسانەکە ئەڵێ) هەردوو چاوی خۆی دەرهێناو سەری خۆی هەڵگرت..

---

[٩٢]- گۆڤاری (كلية الآداب) زانکۆی بەغدا، ژمارە ٣٢،ساڵی ١٩٨٢.

**بەهەشت:** ئەی مەبەستی فرۆید لە (ئەلیکترا) چییەو ئەم ناوەی تری لە کوێ هێناوە..؟

**نەورەسی:** خوشکێ گیان فرۆید ئەڵێ (هەرچۆن کوڕ لە ئەنجامی کپ کردن و خەفەکردنی خۆشەویستی جنسی بۆ دایکی تووشی گرێی (ئۆدیب) ئەبێ.. هەروەها کچیش هەستێکی خۆشەویستی جنسی هەیە بۆ باوکی و ئەم خۆشەویستییە جنسییەی کچە بۆ باوکی ئەبێتە هۆی ڕق هەڵسان و بێزاری بەرامبەر بە دایکەکەی چونکە باوکی داگیر کردووە بۆ خۆی و بووەتە کۆسپ لەڕێی ئەم کچەدا کە ڕابوێرێ لەگەڵ باوکیدا.. دواجار پەیدابونی هەستێك بە گوناهکاری و تووشی (ئەلیکترا = Electra Complex) بون. وە بۆ ئەوەی بزانی فرۆید ئەم وشەیە لەکوێ هێناوە.. ئەمیش هەر لە چیرۆکێکی ئەفسانەیی و پڕ و پووچەوە وەری گرتووە.. گوایا کچێك بەناوی (ئەلیکترا) حەزی جنسی لە باوکی ئەکرد بەڵام لە مێردایەتی باوکی بێبەری بوو ئەمە بووە هۆی ئەوەی براکەی (ئۆرستت)ی هەڵنا، بۆ کوشتنی دایکیان و پاش کوشتنی دایکیشی مێردی کرد بە براکەی خۆی[٩٣].

---

[٩٣]– موسوعة علم النفس والتحليل النفس، ج١، ص٢٦٠.

ئەمیش پێویست بە هیچ چەند و چوونێك ناكات چونكە فرۆید خۆی ئەڵێ (ئەفسانەیەو) بە چیرۆكی ئەفسانەیی ناوی ئەبات .

ئەم خاڵانەی سەرەوە كورتەی ڕاو تیۆرو بیروباوەڕی فرۆید بوو لەبارەی جنسەوە..

* * *

بەهەشت: ئەی ڕای ئیسلام بەرامبەر بە جنس و چارەسەركردنی ئەم كێشەیە.. چییە..؟

نەوڕەسی: لە پێشدا ڕای ئیسلام زانایانی ئیسلامت بۆ باس ئەكەم ئەوجا دێینە سەر چۆنێتی چارەسەركردن و نەهێشتنی ئەو كێشەیە لای ئیسلام .

## جنس لە ڕوانگەی ئیسلامەوە :

**بەهەشت:** جا کاکە گیان ئێستا ئیتر پێخۆشحاڵم لە ڕوانگەی ئیسلامەوە سەیری مەسەلەی جنس بکەین و بزانین ئایا ئیسلامیش (وەکو ئایینی فەلە بەو جۆرە) بێز لەو مەسەلەیە ئەکاتەوەو دەرگای وەڵام دانەوە لە ڕووی هەموو پرسیارێك دائەخات..؟ یان چی..؟

**نەوڕەسی:** خوشکە گیان:

١. مەسەلەی جنس مەسەلەیەکی سروشتی و فیطری و ڕوواوی ناخی دەروون و ژیانی مرۆڤە، هەر کەمتەرخەمییەك لەم مەسەلەیە بکرێت کەمتەرخەمی و پشتگوێ خستنی لایەکە لە لایەکانی ژیانی مرۆڤ.

بەهەشت گیان.. چۆنێتی پەیدابون و گەشەکردنی غەریزەی جنسی لە مرۆڤدا لە دەسەڵات و وزەی مرۆڤ بەدەرەو.. بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی بە خۆی بزانێ لەگەڵ گەورە بون و گەشەکردنی مرۆڤدا ئەو غەریزەیەش گەشە دەکات و مرۆڤەکە بەرەو ئامانجە جنسییەکە ئەبزوێنێ.. نوسەری ئیتالی (بوکاشیۆ)[٩٤] لە کتێبی

[٩٤]- یەکێك بوو لە نووسەرانی سەردەمی ڕاپەڕینی ئەوروپا ساڵی (١٣١٣)ی زایینی (بە ڕێگای بێشەرعی) لەدایك بوو ساڵی ١٣٧٥ کۆچی دوایی کرد... چیرۆکەکانی چێژی نووسەرە موسڵمانەکانی تێدایە.

(دیکامیرۆن) و لە یەکێك لە چیرۆکە کورتەکانی ئەو کتێبەدا ئەڵێ (پیاوێك لە پیاوە ناودارەکانی . فلۆرنسە . ی ئیتاڵیان ژنێکی بوو زۆری خۆشئەویست، ژنەکەی مرد، پاش مردنی خێزانەکەی هەرچی سەروەت و سامانێکی هەبوو کردی بە پارەو پەلی کوڕە تاقانەکەی گرت و شاری بەجێهێشت و ڕووی کردە ئەشکەوت و چۆڵەوانی بۆ ئەوەی وەکو دێوانەو عەودالّ بژی.. بەڵێ ئەم پیاوە بووە هەردی و تەنیا ئەوەندە هەبوو جارجار بۆ شتومەك کڕین ئەهاتەوە بۆ ناو شار ئەوەی پێویستی بووایبە ئەیکڕی و ئەیبردەوە بۆ ئەشکەوتەکەیان.. بەڵام هەرگیز کوڕەکەی لەگەڵ خۆی نەئەهێنا... بەم شێوەیە ڕۆژگارێکی زۆری تەنیایی و دوور لە هەموو ئاوەدانییەکیان بەسەر برد.. هەتا کوڕە تەمەنی گەیشتە هەژدە ساڵان و هەڕەتی هەرزەکاری و لاوێتی و باوکەکەیشی ماڵئاوایی لە لاوێتی کردو بەرەو پیری و پشت کۆمی و چاو کزی ماندوێتی کەوتە ڕێ.. کوڕە داوای لە باوکی کرد کە لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ شارو فێری شت کڕین و هەڵسوکەوتی بکات، بۆ ئەو کاتەی ئەم پەکی ئەکەوێ و لە هات و چۆ ئەکەوێ.. بەڵێ باوکە و کوڕە بۆ یەکەم جار لە ژیانی کوڕەدا لەسەر شاخەکە هاتنە خوارەوە بۆ ئاوەدانی و بۆ شاری . فلۆرنسە. بەڵام کوڕەکە لە خۆشیدا خەریك بوو تووشی گەشکە

بێ.. هەرچی ئەدی یەکەمجار بوو لە ژیانیدا کە ئەیدی.. کۆشك و تەلاری ڕەنگاو ڕەنگی چەند نهۆم.. کەنیسە و گومەزی چوون بەگژ شینایی ئاسماندا.. هەزاران شتی جوان و سەرسوڕهێنەر.. هەر شتێکی ئەدی پرسیاری لە باوکی ئەکرد . ئەوە چییەو بۆچی وایە..؟ کەڵکی چییە..؟..؟

باوکیشی بە نەرمی و لەسەرخۆ بەپێی پلەی تێگەیشتنی ئەو بۆی باس ئەکرد و وەڵامەکەی ئەیدایەوە دەستی.. بەڵام لە ڕێگا تووشی پۆلێ کچ بون.. چۆن کچانێك؟؟.

ئەتوت پۆلە سوێسکەن و ڕەوت ئەکەن.. خۆیان ڕازاندبووەوە لە ئاهەنگێکی زەماوەن (شایی) بون.. کوڕەکە چاوی پێیان کەوت زۆر بە سەرسوڕمان و حەپەسانەوە وتی بە باوکی:

. بابە گیان ئەوانە چین..؟!

باوکە وتی: ڕۆڵە چاوت لەوانە بنوقێنەو سەیریان مەکە ئەوانە پیاو تووشی شەڕو دڵگرانی ئەکەن.

کوڕە وتی: چییان پێ ئەڵێن..؟ باوکەکەیشی ویستی سەری لێ تێکبدات بۆ ئەوەی نەهێڵێ زیاتر سەیری ئەو کچانە بکات و نەهێڵێ غەریزەی جنسی ببزوێ. وتی: ئەوە پێیان ئەڵێن سۆنەی سەوز..

بەڵام کوڕە چونکە لە ماوەی ژیانی هیچ کیژۆڵەیەکی نەدی بوو، چاوی بە کۆشك و تەلار نەکەوتبوو هەرگیز گاو گوێتەڵ و چارەوەو.. هتد.. نەدی بوو لەپڕ وتی بە باوکی: بابە گیان توخودا یەکێ لەو سۆنە سەوزانەم بۆ بێنە.

باوکە وتی: ئاخر کوڕم ئەو شتانە باش نین! خراپن!

کوڕە وتی: بۆچی بابە گیان هەموو شتێکی خراپ ئاوا جوان دروست کراون..؟

وتی: بەڵێ.

کوڕە وتی: بابە گیان نازانم لەم قسەی تۆ تێناگەم.. نازانم بۆ ئەو سۆنە جوانانە خراپن..؟

بەڵام من هەرگیز و لە ژیاندا هیچ شتێکم نەدیووە سەرنجم ڕاکێشێ و خۆشی خاتە دڵمەوە بە ئەندازەی ئەم سۆنانە، ئەم سۆنانە جوانترن لە وێنەی ئەو فریشتانەی بۆت باس ئەکردم.. توخوا بابە گیان دانەیەکیانم بۆ بکڕە با بیبەینەوە لەگەڵ خۆماندا، بڕیار بێ من خواردن و هەموو پێداویستیەکی ژیانی بۆ دابین ئەکەم..)[95] بەڵێ مەسەلەی جنسی فیطری و لەگەڵ سروشتی مرۆڤدایە مرۆڤەکە بە خۆی بزانێ یان نەزانێ.

---

[95]- تطور العلاقات الجنسية، ص٢١٢-٢١٣.

٢. مەسەلەی جنسی بە مانا قووڵە زانستیەکەی نەك تەنیا هۆی مانەوەو وزەی بوژاندنەوەی مرۆڤ و پاڵەپەستۆیەکی بەهێزە بۆ دابین کردنی ژیان.. بەڵکو مەسەلەی جووتەی نێرو مێ، یان (جووتە) بنچینەی دانانی هەموو بونەوەر و هیچ زیندەوەرێك، چ گیانداڕو چ ڕووەك و تەنانەت هەموو ڕەقەمەنی و نائۆرگانیکیش لە جووتە (هیچ نەبێ لە ئەلیکترۆن و پرۆتۆن) پێك هاتووە.

{ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ } سورة يس

جا بەهەشت گیان (وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ) نەك تەنیا بۆ عەرەبە نەفامەکانی کاتی پێغەمبەر ﷺ بەڵکو بۆ زاناکانی سەدەی بیستیش!!

٣. ئیسلام هەرگیز ڕێی نەبڕیوەتەوەو داوای نەکردووە کە ئەندامەکانی ڕۆشنبیری جنسیان نەبێ بەڵکو (ئایینی ئیسلام ئەیەوێت هەموو موسڵمانێ بەقەدەر پێویست لەم پەڕو ئەوپەڕی جنسیش وەك گشت دیاردەو زانستەکانی دیکە بزانێ، چونکی لە پەیوەندی ژن و مێردایەتیدا جنس یەکێکە لە هەرە مەرجە بنەڕەتی و سەرەکییەکان.. بەڵام دواکەوتنی ژیریتی ئەو خەڵکە بۆ خۆیان و دواکەوتنی ڕۆشنبیریێتی و کەم بون ـ یان نەبونی ـ ی مرۆڤی ڕابەرو نەترسی، زیاتر مەیدانیان بۆ ئەوە چۆڵ

کردووە))[٩٦] کە خەڵکی لای ئێمە ڕۆشنبیرێتی جنسیان نەبێ و ئیتر هیچ تاوانێکی ئیسلام نییە.. وا لە خوارەوە هەندێ نموونەت بۆ باس ئەکەم بۆ ئەوەی بزانی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ چۆن بە زەقی بەبێ پەردە باسی مەسەلە جنسیەکانی نێوان ژن و مێرد ئەکات.

أ. عن أبي ذر الغفاري (ر.ض) قال رسول الله ﷺ (وفي بضع أحدكم صدقه) يا رسول الله ﷺ أيأتي أحدنا شهوته ويكون له فيها اجر؟!.

قال ﷺ ارايتم لو وضعها في حرام اكان عليه وزر؟ فكذلك إذا وضعها في الحلال كان له أجر) رواه مسلم[٩٧].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە هاوڕێکانی (و هەموو موسڵمانیش) لە بەکارهێنانی (هەرامەکەتان) لەگەڵ خێزانەکانتاندا خێرو پاداشتی لای خواتان دەست ئەکەوێت.. هاوڕێکانی بە سەرسامییەکەوە فەرموویان/ ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ئێمە بۆ خۆمان ڕائەبوێرین و خۆشیمان پێ دەگات کەچی پاداشتی لای خوایشمان هەیە..؟

---

[٩٦]– ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا، ل٢٧٩.

[٩٧]– ماذا عن المراة، ص٧٨.

مامۆستای ژیان ﷺ فەرمووی: ئایا ئەگەر ئەو (ئاوە) بکاتە جێگایەکی حەرامەوە سزا نادرێت..؟ هەروەها ئەگەر بیکاتە شوێنی حەلاڵ و شەرعی خۆیەوە پاداشتی دەست ناکەوێت.

ب ـ ( لا ترتموا على نسائكم كالبهائم بل اجعلوا بينكم وبينهن رسولا.. قيل وما الرسول يا رسول الله..؟ قال: القُبلة)[98]

مامۆستاکەی ژیانمان ﷺ فەرمووی بە هاوڕێکانی (هەموو موسڵمانێك) وەکو چوار پێ و ئاژەڵی مەکەون بەسەر ژنەکانتاندا، بەڵکو پەیامبەرێك (ی جنسی) با لەنیۆندا هەبێ.. وتیان: ئەو پەیامە چییە ئەی پێغەمبەری خوا.. فەرمووی: ماچ و یەکتری ماچ کردنە.

ج . ( إذا جامع أحدكم أهله، فليصدقها ثم إذا قضى حاجته قبل أن تقضي حاجتها فلا يعجلها حتى تقضي حاجتها)[99]

واتە: ئەگەر هەر کامتان کاری شەرعی کرد لەگەڵ خێزانەکەیدا هەر کە پیاوە زووتر ڕەحەت ئەبوو پەلە نەکات با خێزانەکەیش کاری خۆی ئەنجام بداو ڕەحەت بێ ـ وە هەروەها دەیان فەرموودەی تری سەروەرمان.. بەڵێ بەهەشت گیان هەر ئەو

---

[98] – إحياء علوم الدين، بەرگی ٢، ل٥٢.

[99] – الحياة الجنسية في الاسلام، ص٣٨.

پێغەمبەرەی کە نەخشەی جەنگ و کاروباری سوپاو ڕزگارکردنی گەلانی دادەمەزراند.. غەریزەی جنسی مرۆڤی لەیاد نەکردبوو.

٤. خۆ ئەگەر باسی فەرموودەی زاناکانمان بکەین کە چۆن بێ پەرواو بە زەقی مەسەلە جنسییەکانیان باس کردووەو سنوورێکی تایبەتیان بۆداناوە هەر هەڵنابورێن:

أ. شێخ (جُنیدی) بەغدایی (سۆفی و خواناس دوور لە دنیا) ئەفەرموێ (أحتاج إلى الجماع كما أحتاج الى القوت)[١٠٠]

واتە: پێویستم بە ژن هێنان و کاری جنسی هەیە هەروەك چۆن پێویستم بە بە نان و خۆراك هەیە.

ب. پێشەوا غەزالی ئەفەرموێ (جنس و کاری جنس چەند سوودێکی گرنگی ئایینی و کۆمەڵایەتی هەیە:

١. سوودە ئایینیەکەی: کاری جنس خۆش و تام و مەزەی ڕابواردنی موسڵمانان لە بەهەشتدا پیشان ئەدا چونکە خۆشترین تام و مەزەی ڕابواردنی مرۆڤ لەم سەرزەوییەدا پێکگەیشتنی ژن و پیاو (جماع)ە. هەر وەکو چۆن ناهەموارترین سزا لە ژیانی مرۆڤدا ئاگرە[١٠١].

---

[١٠٠] – الدراسات النفسية عند المسلمين، ص١٨٧.

[١٠١] – هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

٢. سوورده کۆمەڵایەتیەکان: وەکو منداڵ بون و شکاندنی غەریزەی جنسی و ڕێکخستنی کارو باری ژیان لەنێوان ژن و مێرددا، هاوژین و هاوسەری ژیان و کوێر کردنی نەوس و گەلێ شتی تر[102].

ج - وتەی زاناکان و بێ پەردە باسکردنی مەسەلە جنسییەکان زۆر زۆرن بەلاّم وا فەرموودەیەکی ئیمام (رضا . خوا لێی ڕازی بێ) کە تەقە لە بنی مەنجەڵەکە هەڵدەستێنێ ئەکەینە نموونەی ئەوانی تر کە ئەڵێ ( کاری جنسی مەکە لەگەڵ خێزانەکەتدا هەتا گەمەو گاڵتەی لەگەڵ ئەکەیت و یاری بە شوێنە جنسییە بزوێنەکانی ئەکەیت و مەمکی ئەگوشی و.. هەر کە ئەمانەت کرد ئەویش زەوقی هەڵئەستێ و ئاوی کۆ ئەبێتەوە چونکە ئاوی ئافرەت لە بن مەمکی هەیە، وە حەزکردن لەناو چاوان و ڕوومەتی بەدی ئەکەیت ئەو کاتە چەندە حەزت لێیە ئەویش ئەوەندە..)[103].

٥. بەلاّم جنس لای ئیسلام و لە ڕوانگەی ئیسلامەوە -لەگەڵ ئەوەی کە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام و زانایانی ئیسلام ئەو هەموو گرنگییەیان داوەتێ - جنس هەموو کاتێك و لە هەموو

[102]- احياء علوم الدين/٢/٢٥.

[103]- الحياة الجنسية في الاسلام، ص٤٠.

قۆناغەکانی ژیاندا هۆو دەستەویژو ئامراز (وسیلە) یە بۆ گەیشتن بە ئامانج (غایە)یکی پیرۆز نەك کارە جنسییەکە خۆی ئامانج بێ.. بەلأم ئەوانەی . وەکو فرۆید ـ مرۆڤیان جنس پێچ کردووەو هەموو هەڵسوکەوتێکی مرۆڤیان داوەتە دەس جنس و لایان وایە مرۆڤ گیاندارێکی جنسی ڕووتەو هیچی تر.. وا نیەو بە هەڵەدا چوون و لەسەر حیسابی گۆشەکان و بوارەکانی تری ژیانی مرۆڤ پێیان درێژ کردووە.. بەڵێ جنس پارچەیەکە لە مرۆڤ و شێلراوە لەگەڵ هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا.. بەلأم پارچەیەکە لە مرۆڤ نەك مرۆڤەکە خۆی نەك هەموو سەروبەری مرۆڤ[١٠٤].. هەموو غەریزەیەکی مرۆڤ (هۆ)ن بۆ گەیشتن بە (ئامانج).. خوا مرۆڤی دروست کردووە بۆ ئەوەی بە بەرهەم و ئاوەدانکەر و داهێنەر بێ.. نەك هەر وزە بەکاربهێنێ و بەرهەم بەفیڕۆ بدات و دەستکەوتی بفەوتێنێ.

٦. لەبەرئەوەی مرۆڤ وەکو ئاژەڵ و گیاندارەکانی تر وەرزو کاتێکی دیاریکراوی نیە بۆ جنس و کاری جنسی و مرۆڤ سەربەستی تەواوی جنسی هەیە.. پابەندی وەرزو کات، کاری

---

[١٠٤]– بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری (دراسات في النفس الانسانية) ل١٩٦–٢٠٧ بکە.

تێناکات لەبەرئەوە ئەبێ ئیسلام سنوورو ڕێی و شوێنێ بۆ ئەم مەسەلە گرنگەی ژیانی مرۆڤ دابنێ..

دیارییە پیاو و ژن (نێرو مێ) لە کۆمەڵگای مرۆڤ و هەموو گیاندارەکانی تردا هەیە.. وە ئەو غەریزە زۆر قورسەیش هەیە.. پیاو بەرابەر بە ئافرەت وەستاوە.. کچ بەرابەر بە کوڕ چاوی چاوەڕێی جنسی قەتیسماوە، تاقانە دوو ڕێگایش هەیە بۆ چارەسەرکردن و تێرکردنی ئەم برسێتییە.. یان بێ دیاری کردن هەموو ژنێك بۆ هەموو پیاوێك.. نە ژن مێردی دیاریکراوی هەبێ و نە پیاو ژنێکی دیاری کراو.. یان ڕێگای دووەم کە هەر ژنەی بۆ پیاوێك و هەر پیاوەی بۆ ژنێك.. کە ئیسلام (و هەموو ئایینەکان) ڕێگای دووهەمیان هەڵبژاردووە، خۆ مەترسی ڕێگای یەکەم بۆ کۆمەڵ و دیاردەی پشێوی و کەڵەپەترە و نەبونی خێزان و لێ قەومان وماڵوێرانی ئەو منداڵە زۆڵە بێ باوکانە و هەزاران مەترسی تر.. مرۆڤایەتی ئەخاتە گۆمێکی پڕ لە مەترسییەوە کە دوور نیە دواجار سەری مرۆڤایەتیش بخوات و بیکاتە قوربانی جنس.. مامۆستاو پێغەمبەرە دووربینەکەی ژیانمان ﷺ زۆر جوان زانیویێتی مرۆڤایەتی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاژەڵیی و دوور لە ڕەوشتییە (وفي حديث ابي هريرة الذي اخرجه الحاكم قال قال رسول الله ﷺ لا تقوم الساعة حتى توجد

المرأة نهاراً تنكح وسط الطريق لا ينكر ذلك أحدا فيكون أمثلهم يومئذ الذي يقول لو نحيتها عن الطريق قليلاً..)[١٠٥]

واتە: ژیانی سەرزەوی کۆتایی نایەت و ڕەستاخێز نایەت هەتا وای لێ دێ ئافرەت لە ڕۆژی ڕووناك و بە بەرچاوی خەڵکی لە ناوەڕاستی ڕێگا گشتییەکاندا پیاو ئەنێ لە خۆی و هیچ کەس نیە لۆمەو سەرزەنشتی بکات و کەس ناتوانێ نەهێڵێ.. پیاوێ خۆی بە شت بزانێ هەر ئەوەندە توانای هەیە بڵێ خۆزگە نەختێك لەسەر ڕێگاکە ئەتبردە ئەولاوە..) ئایا چڵکاو خۆرەکانی ئەورووپا لای خۆمان ئاواتی ڕۆژێکی وایان نیە..؟ ئایا شانازی بەم دیمەنە دڵ تەزێنە دوور لە هەموو مرۆڤایەتی و پڕ لە ژیانی ئاژەڵی و خووخدەی دڕندانە ناکەن..؟

٧. مرۆڤ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە نە فریشتە (ملائکە)یە وەکو میسالی و ئایدیالییەکان وا ئەزانن کە ئەبێ هەموو ئارەزوو و غەریزەیەکی جنسی خۆی خەفە بکات وەکو فریشتەیەك لە جیهانی ئەندێشەدا بژی وە نە بە شەیتان و گیاندارێکی چەپەڵ سەیری ئەکات و بە بەندەی ورگ و بەری بزانێ.. هەموو ئامانج و هیواو بیرکردنەوەو سەروبەری ژیانی تەنیا تێرکردنی ورگ و غەریزە بێسنوورە جنسییەکەی بێ.. وەکو مادییەکان لایان وایە.

---

[١٠٥]– خلق الانسان بين الطب والقرآن، ص٢١٢.

بەڵكو مرۆڤ لای ئیسلام . گیانداریكی خاوەن لاشەو تەن و داخوازییەكان و دیسان خاوەنی گیان و پاك و بێگەردی گیانە. مرۆڤ ئەتوانێ خۆی بدات بەدەم لاشەوە هەتا ئەچێتە ڕیزی ئاژەڵ بەرگێكی شەیتان لەبەر ئەكات.. وە هەر ئەو مرۆڤە ئەتوانێ خۆی بدات لەدەم داخوازییەكان گیان (روح)ەوە هەتا لە پاكی و بێگەردی و دڵڕووناكی، وەكو فریشتەیەكی سەرزەوی لێدێ.. ئیسلام هەموو ئامانجێكی ئەوەیە (وەكو تاقانە بەرنامەیەكی واقیعی و ڕاستەقینە) چۆن لەناو ئەم دوو مۆتەكەیە بژی و تاقانەترین چارەسەری مامناوەندی بۆ دابنێ. بەكورتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام میانەیە لە هەموو شتێكدا { وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ } البقرة: ١٤٣.

واتە: بەو شێوەیە ئەی گەلانی موسڵمان ئێوەمان كرد بە میللەت و گەلێكی میانە بۆ ئەوەی چاودێر و ڕەخنەگر و ڕاست كەرەوەی هەڵەكان و ڕێبازە چەوتەكانی ئادەمیزادبن لەژیانی ئەم جیهانەداو شایەتی كردەوەكانیشیان بن لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا[١٠٦].

٨. جنس لە ڕوانگەی ئیسلامەوە غەریزەیەكی زۆر ترسناكە.. ئەگەر سەركوت بكرێت و تێر نەكرێت مرۆڤایەتی بەرەو

[١٠٦]– سەری (في ظلال) و مانای ئەم ئایەتە بكە.

ترسناکی و بنەبڕی ئەڕوات و ئەگەر زیاتر لە پێویستی خۆی جڵەوی بۆ شل بکرێت دیسان بەرگی مرۆڤایەتی لە مرۆڤ دائەڕنێ و ئاژەڵێکی ناپەسەندی بەدڕەوشتی لێ دەرئەچێت[107] و هیچ هێزێك نیە بتوانێ برسێتی . یان ڕاستتر بڵێین هاڕێتی و کەف و کوڵی دامرکێنێ و. تێری بکات.. وەکو ئەو تینوەی ئەیەوێ بە سوێراوی دەریا سوێراوەکان تێراو ببێ و تینوێتی بشکێت.

---

[107] – نظرية فرويد، دراسة وتحليل، ص١٢.

## ئەی چارە... ؟

تاقانەترین چارەسەر ئەوەیە کە ئیسلام و قورئان (بەرنامە پیرۆزەکەی ئێمە) دایناوە.. کە ئەویش لە چەند خاڵێکدا باس ئەکەین..

یەکەم/ قەدەغە نەکردنی ژنهێنان: ئیسلام، هەرگیز مرۆڤ ناخەسێنێ بەناوی داوێن پاکی و ڕەوشت بەرزییەوە.. کاری جنسی بە گڵاو و چەپەڵ دانانێت.. بەڵکو ئیسلام ڕازی نابێ بەناوی ئایینەوە واز لە ژنهێنان و ژن و مێردی بهێنرێ و مرۆڤی موسڵمان خۆی بێبەری بکات لەو غەریزە سروشتییە.. فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا لەم بارەوە زۆر زیاترن لەوەی بۆ ئێمە بنوسرێن (لەم کتێبەدا) بەڵام وا تاقانە فەرموودەیەکی ئەخەینە پێش چاو بۆ ئەوەی بزانین پێغەمبەری پێشەوا چەندە دڵگرانە بە وازهێنان لە ژن هێنان و نەویستنی ژیانی خێزانی:

(عن انس رضی الله عنه) قال: جاء ثلاثة رهط الى بيوت ازواج النبي ﷺ يسألون عن عبادة النبي ﷺ فلما اخبروا كأنهم تقالوها وقالوا: أين نحن من النبي ﷺ وقد غفر له ما تقدم من ذنبه وما تأخر.. قال احدهم اما انا فأصلى الليل ابدا، و قال الآخر وانا اصوم الدهر ولا افطر وقال الآخر وان اعتزل النساء فلا اتزوج ابداً، فجاء رسول الله ﷺ اليهم فقال: انتم الذين قلتم

كذا وكذا، اما والله انى اشاكم لله واتقاكم له، لكنى اصوم وافطر، واصلى وارقد واتزوج النساء فمن رغب عن سنتي فليس منى، متفق عليه[108].

واتە: سێ پیاو هاتن بۆ ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەی پرسیار بکەن لە چۆنێتی خواپەرستی پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە چۆنێتی خواپەرستییەکەی پێغەمبەریان بۆ باس کردن بە کەمیان هاتە بەر چاو، وتیان: کوڕە ئێمە لەکوێ و پێغەمبەری خوا لە کوێ..؟!، ئەو خوا لە هەڵەی ڕابردوو و داهاتووی بووردووە پێویستی بە خواپەرستی زۆر نیە..

یەکێکیان وتی من بڕیارم داوە هیچ شەوێ ناخەوم و هەر شەونوێژ ئەکەم .

ئەوی تریان وتی: منیش هەموو ڕۆژانی ساڵ بەڕۆژوو ئەبم هیچ ڕۆژێکی لێ ناشکێنم .

سێهەم وتی: منیش بڕیارم داوە لە ئافرەت دوور ئەکەومەوەو هەرگیز ژن ناهێنم .

لەم کاتەدا پێغەمبەری پێشەوا ﷺ هاتەوە بەسەر قسەکانداو وتەکانیان بۆ گێڕایەوە.. ئەمجا پێغەمبەر ﷺ ڕووی تێکردن و فەرمووی ( ئەوە ئێوە واتان وتووە.. بەڵام من سوێن بێ بە خوای

---

[108]- فمن رغب عن سنتي فليس مني، ص١٩-٢٠ سەیر بکە.

گەورە.. لە هەمووتان زیاتر لەخواترسم و خۆم لە هەمووتان زیاتر لە سنوورەکانی ئەپارێزم.. بەڵام بەڕۆژویش ئەبم و هەندێ ڕۆژیش بەڕۆژوو نابم.. شەونوێژیش ئەکەم و ئەیشخەوم.. وە ژنیش دێنم و دوورە پەرێز نابم لە ئافرەت.. ئەمە سوننەت و ڕێبازی ژیانی منەو هەر کەسە لەم ڕێبازە لا بدات پەیوەندی بە منەوە نیەو موسڵمان نیە.. جا سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن چۆن یەخەی خۆی هەڵئەتەکێنێ و لە ئیسلام بێبەری ئەکات ئەوەی ئەیەوێ ژن بهێنێ و لەکاری جنسی شەرعی هەڵێت..

کەواتە ژن نەهێنان لە ئیسلامدا نیەو موسڵمانان ئەبێ ژن هاوەرو خاوەن خێزان بێ.

دووهەم: دانانی یاسای ژنهێنان و ئاسانکردنی: پێش ئەوەی باسی ڕێی و جێی و یاسای ژن و ژنخوازی بکەین لەڕووانگەی ئیسلامەوە پێویستە بزانین ئایا ڕای ئیسلام بەرابەر بە ژنهێنان چییەو شەریعەتی ئیسلام (فقه) چی ئەفەرموێ:

أ. ڕای زانایانی ئیسلام (هەموو زاناکان) ئەوەیە: ئەوەی ترسی تووش بونی کاری جنسی حەرامی هەبێ ئەوە ئەرك (واجب)ێکی شەرعییە کە ژن بهێنێ و ئەگەر پشتگوێی بخات گوناهبار ئەبێ.. بەڵام ئەوەی ترسی نەبوو ئەوە سوننەتی پێغەمبەری خوایە

بیهێنێ و لە ژنهێنانەکەی خێری گەورەی دەست ئەکەوێ[109] ..

ئەمە ڕای زانایانی شەرع.. خۆ ئەگەر گوێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەرمان ﷺ بگرین سەیر ئەکەین دەیان فەرموودەی هەیە کە مرۆڤ بە تایبەتی لاوان هان ئەدات بۆ ژنهێنان، وە ژن هێنان بە نیوەی باوەڕ دائەنێت و ئەفەرموێ:

( إذا تزوج العبد فقد أستكمل نصف الدين، رواه البيهقي)[110]

واتە: هەر بەندەیەکی خوا ژن بهێنێ وا نیوەی ئایینی تەواو کردووە وە ئەفەرموێ: (من تزوج فقد أحرز شطر دينه فليتق الله في الشطر الثاني[111]/ إبن الجوزي في العلل حديث أنس)

واتە هەر کەسە ژنی هێنا بەشێکی ئایینەکەی تەواو کردووە، با لەخوا بترسێ و خۆی بپارێزێ لە فەرمانەکانی خوا بۆ تەواو کردنی بەشی دووهەمی.. بەڵێ پێغەمبەر ﷺ ژنهێنان و تێرکردنی غەریزەی جنسی بەنیوەی ئایین دائەنێ..

ب. بەڕاستی لەم ڕۆژگارەی کە موسڵمانان زۆر دوورن لە ئیسلامەوە مەسەلەی مارەیی وەکو مەسەلەی کڕین و فرۆشتنەکەی کاتی نەفامێتی عەرەبی لێهاتووە.. بەتایبەتی

---

[109]- فقه السنة، ص١٥، بەرگی ٢.

[110]- المراة بين البيت والمجتمع، ص٤٣.

[111]- إحياء علوم الدين، ص٢٣، بەرگی ٢.

هەندێك لە چینی ئافرەتی ڕۆشنبیرو خوێنەوار شانازی بە زۆری مارەیی و قوڕ بەسەراکردنی کوڕە هاوسەرەکەیەوە ئەکات.. لەگەڵ ئەوەیشدا مارەیی ئافرەت لە ئیسلامدا بریتی نیە لە کڕینی ئافرەتەکە.. بەڵکو بریتیە لە دیارییەك کوڕەکە و قەرزداری دەست پانکردنەوە لە خەڵکی نیە.. ئەمە لەلایەکەوە، لە لایەکی ترەوە پێشکەش کردنی مارەیی لەلایەن کوڕەکەوە مانای بەدەمۆچوون و پەرۆشی کوڕەکە (زیاتر لە کچەکە) ئەگەیەنێ، بۆ ئەوەی تای تەرازووی نرخی ئافرەتەکە لاسەنگ نەبێ، زۆرجار مەسەلەی مارەیی و گرانی ئافرەت (یان ڕاستتر بڵێین فرۆشتنی ئافرەت) وەکو لەم چەرخەی نەفامێتی سەردەمە بەدی ئەکەین، ئەبێتە کۆسپ و ئەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی زۆر نەخۆشی ڕەوشتی لە کۆمەڵەکەدا.. پێغەمبەری پێشەوا سەرنجی بۆ ئەم مەسەلە گرنگە ڕاکێشاوین و ئاگاداری کردووین کە پارەو ماددە لە ژیانی خێزانیدا شتێکی سەرەکی نییە.. زۆرجاری وا هەیە ژنە هەژارێك بەختیارترە لە ژنە دەوڵەمەندێك بۆیە پێغەمبەرمان فەرموویەتی: ( إذا جائكم من ترضون خلقه ودينه فزوجوه الا تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد كبير )[112]

---

[112]- الحياة الجنسة في الأسلام، ل٢١.

واتە: هەر کەسە هاتە داخوازی کچەکەتان لەڕووی ڕەوشت و ئایینەوە تەواو بوو کوڕێکی ڕەوشت بەرزو ئایین پاك بوو کچەکەی بدەنێ (و چاوتان لەناو دەوڵەمەندی و.. نەبێ خۆ ئەگەر (لەبەر ئەو شتە ماددیانە) کچەکەتان ئەدەن بە شوو و بەڵایەکی گەورەو بەدڕەوشتی و داوێن پیسییەکی گەورە بڵاوئەبێتەوە..) ئەوە بۆ خاوەن کچ و کچەکە.. دیسان ڕوو ئەکاتە کوڕە موسڵمانە ژنهێنەرەکەو، ئەفەرموێ:

( من تزوج امرأة لعزها لم يزده الله إلا ذلا، ومن تزوجها لمالها لم يزد الله الا فقرا، ومن تزوجها لحسبها لم يزده الله إلا دناة ومن تزوجها لم يرد بها إلا أن يغض بصره ويحصن نفسه بارك الله له فيها وبارك لها فيه )[113]

واتە/ هەر پیاوێك ئافرەتێك بهێنێ لەبەر پایەبەرزی ناو خەڵکی، خوای گەورە زیاتر پەست و خواری ناو کۆمەڵی ئەکات.. وە هەر کەسە ئافرەتێك بخوازێ لەبەر دەوڵەمەندی ئافرەتەکە، خوای گەورە زیاتر هەژارو ڕەجاڵی ئەکات.. وە هەر کەسە دڵی لە هەر ئافرەتێك بچێ و بیهێنێ، تەنیا لەبەر حەز لێکردن و ڕابواردنی جنسی، خوای گەورە لەبەرچاوی یەکتری سووك و ڕیسوایان ئەکات و خۆشەویستیەکە ئەبێتە نزمی پلەی هەریەکەیان

[113]- تطور العلاقات الجنسية، ص١٨٢.

لەبەرچاوی ئەوی تر.. بەڵام هەر کەسە ئافرەتێك بهێنێ بۆ ئەوەی چاوی لە شەرەف لستنەوەی خەڵکی بگرێ و خۆی نەوس کوێر بکات و قەڵایەکی ڕەوشت بۆ خۆی دامەزرێنێ ئەوە کوڕەکە خێر لە کچە ئەبینێ و پشووی دڵی دەست ئەکەوێت، کچەکەش خێر لە مێردەکەی ئەبینێ و خێزانێکی بەختیار دروست ئەکەن.. وە دیسان ئەفەرموێ: ( تنكح المرأة لأربع، لحسبها، لجمالها، و لدينها، فاظفر بذات الدين تربت يداك )[١١٤]

واتە: ئەوانەی ژن ئەخوازن لەبەر خاتری چوار شتی ئافرەتەکەیە.. یان لەبەر دەوڵەمەندی ئافرەتەکە ئەیخوازێ، یان لەبەر ئۆجاخ زادەیی و کەسداری ئافرەتەکە، یان لەبەر جوانی ئافرەتەکەیە یان لەبەر دینداری ئافرەتەکە بەڵام تۆ (ئەی موسڵمان) ئافرەتێکی خاوەن باوەڕو ئایین پەروەر بهێنە دەستی خۆتت وەشاندووەو نێچیری خۆتت دەست کەوتووە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم فەرموودانەی سەروەرمان ﷺ بۆمان دەرئەکەوێ کە نرخی ئافرەت بەرز نابێتەوە بە گرانی مارەییەکەی و لەبەر چاوی مێردەکەی (ئەگەر موسڵمان بێ) کەم و زۆری مارەییەکەی قورس و سووکی ناکات.. هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر ئەفەرمووێ:

---

[١١٤]- الروضة الندية، ص٤.

(من بركة المرأة السرعة تزوجها و يسر مهرها)
واتـه: لـه فـهڕداری و خێـرداری ئافرەتـه كـه زوو بـدرێ بـه شـوو، مارەییەكەیشی سووك و ئاسان و كەم بێ.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا پیرۆزە زێڕینەكەی ئیسلام و سەیری چۆنێتی كچ بەشوودان و ژن و ژنخوازیان بكەین.. سەیر ئەكەین بەهیچ شێوەیەك دیمەنی ئەرك و ماندوێتی بیانوو گرتنی تێدا نەبووەو زۆر بە ئاسانی ئەم مەسەلە پیرۆزەیان جێبەجێ كردووە.. وەكو:

أ فاطمە ی كچی پێغەمبەر ﷺ كاتێ مارەی كرد لە عەلی كوڕی ئەبو طالب (خوا لە هەموویان ڕازی بێ) مارەییەكەی پارەی قەڵغانێكی جەنگ بوو كە لە چەند درەمێك تێنەئەپەڕی.

ب. پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری سەروەرمان و فەرمووی (ئەمەوێ فلانە كچ بخوازم) فەرمووی (هیچت هەیە بیكەیتە مارەیی..؟) پیاوەكە وتی (نەخێر) پێغەمبەر فەرمووی بڕۆ لەماڵەوە بگەڕێ بزانە هیچت دەست ناكەوێ.. ڕۆیشت و هاتەوە لای پێغەمبەری خۆشەویست و وتی (هیچم دەست نەكەوت) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی تەنانەت ئەموستیلەیەكی ئاسنیشت نیە.؟!

پیاوەکە وتی: نەوەڵلا.. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی چەندە قورئانت لەبەر کردووە.. پیاوە وتی: ئەو سورەتەو ئەو سورەتە، پێغەمبەر ﷺ مارەی بڕی لە کابرا لەسەر ئەو ئەندازە قورئانەی لەبەری کردبوو..

ج. زانای پایەبەرز و بەناوبانگی ئیسلام (سعیدی کوڕی مسیب خوا لێی خۆش بێ) کچێکی زۆر زاناو جوانی هەبوو لەکاتی میرنشینی ئەمەوییەکاندا (عبدالملك ی کوڕی مەڕوان) داخوازی ئەم کچەی کرد بۆ (ولید)ی کوڕی.. وە بڕیاریدا کە کێشانەی کچەکە بکاتە ئاڵتون و بە شێوەی مارەیی بیداتە کچە[115].

بەڵام سعیدی خواپەرست قایل نەبوو بە تێکەڵاوی لەگەڵ خێڵی ئەمەوییەکاندا لە لایەکەوە لەلایەکی ترەوە کچ فرۆش نەبوو..

ئەی چۆن دای بە شوو..؟ ئایا بە پارەیەکی زیاتری دا..؟؟

با گوێ لە عبدالله ی کوڕی أبو وداعە . کە یەکێك بوو لە قوتابیە زیرەك و خواپەرستەکانی خۆی بگرین، (لەو ماوەدا کە زۆر لە کۆڕو دانیشتنەکانی (سعید)دا بەشداریم ئەکردو هۆگری بوو بووم، ماوەیەك ون بووم کاتێ هاتمەوە لای سعید، فەرمووی: ئەوە (عبدالله) ئەم ماوەیە لەکوێ بوویت..؟

---

[115]- ماذا عن المراة، ص٦٣.

وتم: قوربان خێزانەکەم مامۆستا خۆش، هەندێك سەرقاڵی ئەوە بووم.. فەرمووی: ئەی بۆچی ئاگادارت نەکردین با ئێمەیش لە پرسەکەتدا هاوبەشیمان بکردیتایە..؟

(پاش ماوەیەك گفتوگۆ گەرەکم بوو بڕۆم) مامۆستا فەرمووی: ئەرێ عبدالله ئەی لە هیچ کوێوە ژنێ شتێکت پەیدا نەکردووە..؟ وتم: قوربان . خوا ڕەحمت پێ بکات کێ ژن ئەدا بە ڕەجاڵێکی وەکو من، هەمەو نیمە یان دوو درەم یان سێ درەم پارە شك ئەبەم.. مامۆستا فەرمووی: من.. بە پەرۆشییەکەوە وتم: چۆن..؟ تۆ، جا ئەمدەیتێ..؟!

فەرمووی: بەڵێ و دەستی خستە ناو دەستم دەستی کردە مارە بڕینی کچەی لە من لەسەر دوو درەم یان سێ درەم.. پاش مارەبڕین هەڵسام نەمئەزانی لە خۆشیاندا بۆ کوێ بڕۆم و چی بکەم؟؟

ئەو کچەی کە بنەماڵەی خەلیفە و بەو هەموو سامان و دەبدەبەوە شەیدای بون ئێستا بەدوو درەم لە منی مارە کرد.. ئێوارە بەڕۆژوو بووم.. لە مزگەوت نوێژم کردو گەڕامەوە بۆ ماڵ بۆ ئەوەی بەربانگ بکەمەوە هەر بیرم لەوە ئەکردەوە.. پارە لەکێ قەرز بکەم.. دەست بکەم بە پشتێنی کێدا..؟ سەیرم کرد یەکێك دای لە دەرگا.. وتم ئەوە کێیت..؟

وتی: سعید.. منیش بە شێوەیەك بیرو هۆشم پەرت بوو بیرم لە هەموو سعید ناوێك ئەكردەوە تەنیا (سعیدی كوڕی مسیب)م بەبیردا نە ئەهات.. چونكە ئەوە ماوەی چل ساڵە (سعید) لە هیچ جێگایەك نەبینراوە تەنیا لە ماڵەوە بۆ مزگەوت و لە مزگەوتەوە بۆ ماڵ.. هەڵسام و چووم بە دەمیەوە و دەرگاكەم كردەوە، سەیرم كرد (مامۆستا سعیدی كوڕی مسیب)ە، یەكسەر لە دڵی خۆمدا وتم: بە خوا ڕەنگە لە ڕاكەی پەشیمان بوو بێتەوە.. وتم: مامۆستا بۆچی عەزیەتت كێشاوە ئاگادارت بكردمایە من ئەهاتمە خزمەتت.. فەرمووی: نا، هەقی تۆیە خەڵكی بێن بۆ لات.. وتم: قوربان فەرموو.. وتی: برا تۆ كابرایەكی بێ خێزان بوویت و ژنت مارەبڕی.. حەزم نەكرد ئەمشەو بەتەنیا شەو بەسەر بەریت.. فەرموو ئەوە خێزانەكەت.. سەیرم كرد لە دوایەوە ئافرەتێك وەستاوە.. ئافرەتەی كردە ژوورەوەو خۆی لێی دا ڕۆیشت.. دەستیم گرت و بردمە ژوورەوە سەیرم كرد جوانترین ئافرەت و شارەزاترین كەسە لە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەردا ﷺ..[116]

---

[116]– احياء علوم الدين، المطبعة التجارية، ص١٠٤، ج٢، لە كتێبی (تطور العلاقة الجنسية بين الرجل والمرأة) ل١٨٢.

د. ڕەنگە هەندێ دوور لە موسڵمان و ناشارەزا لە ئیسلام بڵێ ئەو هەڵوێستانە ناوێزەیە (شاذ)و لە سەدە سەرەتاییەکانی ئیسلام ڕوویداوەو ئێستا ئێستا هەرگیز شتی وا نابێ.. با بزانین ئێستایش وە لە ڕۆژانی پڕ لە نەفامێتی سەدەی بیستدا.. زۆر لەو هەڵوێستە ئیسلامییانە ( لەخوا بەزیاد بێ بەدی ئەکرێن.. هەر ئەمساڵ (١٩٨٢) مامۆستا شارەزووری ئامادەی مارەبڕینی (کچێکی موسڵمانی ئەندازیار بۆ کوڕێکی موسڵمانی ئەندازیار) بوو کە هەردووکیان ئەندازیار بون لە بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆی پارێزگای کەرکوك.. مارەییەکەی بریتی بوو لە لەبەرکردنی سورەتی (أنعام) و (نور) دیاری قورئانێکی زەرکەفت و هیچی تر و دەیان لەم تابلۆیانە هەیە.

هەرزانی مارەیی و لابردنی کێشەی دارایی و سامان و پارە پەیدا کردن یەکێکە لەو خاڵانەی ئیسلام چارەسەری کێشەی جنسی پێ ئەکات.

سێهەم: بۆ دەوڵەتی ئیسلامی هەیە لە سامانی گشتی ژن بۆ لاوەکان بگوێزێتەوە ئەگەر چی پارەی (زەکات)یش بێ..

( لەکاتی خەلافەتی عمری کوڕی عبدالعزیز دا (خواڵێ ی ڕازیبێت) بە پارەی زەکات ژنیان بۆ لاوانی سەراسەری ولاتی ئیسلامی هێنا..)[117].

چوارەم: لای ئیسلام پەیوەندی نێوان ژن و مێرد زۆر پیرۆزە، بەشێوەیەك هانی خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد ئەدا ئەیگەیەنێتە ڕیزی خواپەرستی..

سەروەرەکەمان ﷺ ئەفەرموێ:

( أن الرجل إذا نظر إلى إمرأته ونظرت إليه نظر الله اليهما نظر رحمة، فاذا أخذ بكفيها تساقطت ذنوبها من خلال أصابعهما[118] - الرافعي في تأريخه عن ابي سعيد الخدري).

واتە: کاتێ پیاو (مێرد) بە خۆشەویستیەوە سەیری ژنەکەی ئەکات و ژنەکەی (بەهەمان خۆشەویستیەوە) سەیری مێردەکەی ئەکات، خوای گەورە بەچاوی ڕەحمەت و خێرەوە سەیری هەردووکیان ئەکات، خۆ ئەو کاتە پیاوەکە دەستی خۆشەویستی ئەخاتە ناو دەستی ژنەکەی و دەستی یەکتری ئەگرن گوناهەکانیان لەنێو پەنجەکانیانەوە هەڵئەوەرێ.

---

[117] – حوار مع الشيوعيين في أقبية السجون، المحامي عبد الحليم الخفاجي، ص٣٣٢.

[118] – فيض القدير، ص٣٣٢، ج٢.

کام هاندان لەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بەرزتر هەیە..؟؟

پێنجەم: داخستنی دەرگای داوێن پیسی و کاری جنسی ناشەرعی نێوان ژن و پیاو.

**بەهەشت:** کاکە گیان.. کاك صبحی خۆمان چەند خاڵێکی جوانی نووسیوە لەسەر هۆی پەیدابونی داوێن پیسی و بەرەڵڵایی ئەگەر ئەفەرمووی ئەیخوێنمەوە.

**نەورەسی:** فەرموو..

**بەهەشت:** ئەڵێ (بێگومان ئەمەیش وەك گشت دیاردەکانی دیکەی ژیان هۆی تایبەتی و مەوزوعی هەیە کە ئەمانەی لای خوارەوە تا ڕادەیەك بونەتە مەرجی پەیدابونی ئەو دەردە:

١. بڵاوبونەوەی بیروباوەڕی نابەجێی فرۆیدی لەناو لاوەکانداو بەجۆرێ کە جنس بە گەورەترین شت لە ژیاندا وەربگرن.

٢. دواکەوتنی ژنهێنان، کار دەکاتە سەر ئافرەتیش و پیاویش کە لە تەمەنێکی گەورەدا ژن بێنن یان شوو بکەن.

٣. بونی بۆشاییەکی گەورە لە ژیانی ڕۆژانەی لاواندا، نەبونی یانەی کات بەسەربردن و کتێبخانەو شوێنی یاری کردن و ڕابواردن.

٤. پێ لێهەڵبڕینی ئافرەت لە خۆدەرخستنی ئەندامانی هەست ڕاکێشەرو جۆش جولاندن، وەك دەرپەڕاندنی سمت و سنگ و

مەمك، بێ ئەوەی حیسابێ بۆ شەرم و شکۆ بکرێ، هەموو وەك کەرەسەی پیشاندان لەسەر شەقام و شوێنە گشتییەکاندا دەردەکەون.

٥. نەبونی سەربەستی هەڵبژاردنی هاوسەرو تێر نەکردنی ژن لەلایەن پیاوەکەیەوە..) وە مامۆستا (صباح) دەربارەی ئافرەتی سۆزانی و پیاوی شەرواڵ پیسەوە ئەڵێ ( ئافرەت و پیاوی داوێن پیش وێنەی ڕەسەنی خۆیان تێکداوەو مرۆڤایەتیان و نەفسییەتیان دۆڕاندووە، ئەو جۆرە پەیوەندییەش نامرۆڤانەیەو لە بنچینەدا لەسەر هەڵخەڵەتان و بازرگانی و دەست گەرم کردنەوە دروست ئەبێ، پیاو بۆ دڕندەیی و ئاژەڵی ڕادەکێشێ و لە ئازارو ئۆف بەولاوە بەهیچ ناگەن، هەستێکی قووڵ بە پڕنەبونەوەی ئەو بۆشاییە دەکەن، بەرەو هەڵدێرو زویری و بیر تەسکی ژیان ڕایان دەکێشێ )[119].

ئەوڕەسی: زۆر جوانە، بەهەشت گیان، جا هەر لەبەر ئەم خۆفرۆشتن و مرۆڤایەتی ژێر پێخستنەیە ئیسلام سزاو تۆڵەی بۆ شەرواڵ پیسان و سۆزانی داناوە.. بۆیە ئەمڕۆ کە ئەو تۆڵەو سزا خواییانە نەمان کۆمەڵ چەپەڵ ئەبێ و کەس لە شەرەف و ماڵ و دارایی و ئابڕووی دڵنیا نیە.

---

[119]– ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا، ل٢٧٧–٢٧٨.

ئا بەم شێوەیە بۆت دەرکەوت کە ئیسلام تاقانەترین چارەسەر بۆ جنسی و کێشەی جنسی دائەنێ و نە سەرکوتی ئەکات وەکو مەسیحی میسالیەکان نە بەرەڵلای ئەکات و کۆمەڵ پیس ئەکات وەکو ماددی و فرۆیدییەکان.. بەڵکو بە پیرۆز و لە سنوری رێز و خۆشەویستیدا جێگای راستەقینەی خۆی و چارەسەری پڕ بە پێستی خۆی بۆ دائەنێ.

## کوشتن یان مارەبڕین :

بەهەشت: کاکە گیان بەداخەوە ئیسلام وەکو لە زۆربەی مافەکانی مرۆڤدا ئافرەتی لەبیرچووە، هەروەها لەڕووی جنسی و هەڵبژاردنی هاوسەر و هاوژینی خۆی هیچ جۆرە مافێکی نەداوەتێ، پیاو (باوك یان برا) بۆیان هەیە بێ پرس و بەناوی مارەبڕینەوە بیفرۆشن.. چۆن ئەبێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەمە هەڵوێستی بێ بەرابەر بە ئافرەت.. نیوەی کۆمەڵ دایك و خوشك و ژن و هاوسەری هەموو پیاوانن،..؟!!.

نەوڕەسی: ئای بەداخەوە بۆ تۆ بەهەشت گیان.. چۆن لەبارەی ئافرەتەوە ئەوەندە لە ئیسلام ئەزانی..؟ چۆن ئەوەندە بێئاگای لەو مافە ڕەوایانەی کە ئیسلام پێش (١٤٠٠) ساڵ دیاری کردووە ئێستایش لە سەراسەری زەویدا لە هیچ دەوڵەتێکدا ئافرەت نەگەیشتوونەتە ئەو مافانە..؟ ئەی بەداخەوە بۆ تۆ خوشکێ گیان.

بەهەشت: هەروا هەندێ ئامۆژگاری پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بیستووە لەبارەی ئافرەتەوە فەرموویەتی بەڵام بەو شێوەیە نییە..

نەوڕەسی: ئەم باسەی من و تۆ ماوەی ئەوەمان نادات هەموو مافە ڕەواکانی ئافرەتت لە ئیسلامدا بۆ باس بکەم، چونکە

جیهانێکی بەربڵاو و فرە لایەنە. بەڵام بەسەر پێیەکەوە باسی مافەکانت بەگشتی بۆ ئەکەم و مافی جنسی و مافی شووکردن و هەڵبـژاردن و دیـاری کردنـی هـاوژین و مێردەکـەیت، نـەختێك درێژتر بۆ باس ئەکەم.

١. ئیسلام لەڕووی مرۆڤایەتییەوە بە یەك چاو سەیری ئافرەت و پیـاو ئـەکات و هـیچ جیاوازییـەکیان نیـە{يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً} النساء:١.

واتە: ئەی ئادەمیزادان ( ژن و پیاو، نێرو مێ ) لەو خوایە بترسن کە دروستی کردوون لە یەك ( نفس = گیان، دەروون ) دوایـی هەر لەو (نفس)ە ژنەکەی بۆ دروست کردو لەو جووتە کەسە پیاو و ژنێکی زۆری لێ خستنەوە.. لە کاتێکدا تا ئەم ساڵانەی دوایـی ئەوروپا لای وابوو چۆنێتی دەروونـی ئـەو گیانـەی ئافرەتی لێ دروست بـووە جیـاوازە لەگـەڵ دەروون و گیـانی پیاودا بـەڵام.. بــەلای ئیســلامەوە لــە ڕووی مرۆڤایەتییــەوە ژن و پیــاو هــیچ جیاوازییەکیان نیە.

٢. لەڕووی ئاین و ئەرکی ئایینی و پاداشتی خوای (ژن و پیاو) هیچ جیاوازییــــەکیان نیــــە: { مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ } النحل:٩٧

واتە: هەر کەسە کردەوەی چاك بکات ئیتر پیاو بێ یان ژن نێرینە یان مێیینە، ئەوە بە باوەڕدارو موسڵمان دائەنرێت.. بە ژیانێکی پاك و ئاسودە ئەیژێنین وە گەڵێ چاکتر لەو کردەوە چاکانەی ئەوان ئێمە پاداشتیان ئەدەینەوە، ئەمەو گەڵێ ئایەتی تری قورئانی پیرۆز لەم بارەوە[120].

٣. سەربەستی بیروباوەڕ: ئافرەت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بەرپرسیار نیە لە بیروباوەڕی مێردەکەی و مێردەکەشی هەروەها. هەریەکەیان مافی سەربەستی بیروباوەڕی هەیە و هەریەکەیان چ ئایینێك چ بیروباوەڕێك هەڵئەبژێرن سەربەستن.. پیاوی بۆی نییە بەزۆر ژن موسڵمان بکات دروستە پیاوی موسڵمان ئافرەتێکی گاور یان جوولەکە مارە بکات و گەرچی ئافرەتەکەیش لەسەر ئایینەکەی خۆی بمێنێتەوە..

بەهەشت: کاکە گیان هەندێك ئەڵێن گوایا ئێستا ئەم مارەبڕینە دروست نیە، چونکە ئەو گاور و جوولەکانە لەسەر ئایینە ڕاستەکەی خۆیان نەماون..؟

---

[120] - سەیری کتێبی (الفهرس الموضوعي لآيات القرآن الكريم، ص٤٣٦-٤٤٠ بکە).

**نه‌وره‌سی: وانییه به‌هه‌شت گیان، چونکه کاتێ ئایه‌تی:** { ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ } المائدة:٥

**واتـه: ( ئـه‌مڕۆ لـه هـه‌موو خـواردنێکی پـاك و خـاوێن بـۆ ئێـوه ڕه‌وایـه.. هـه‌روه‌ها دروسـته و ڕه‌وایـه بۆتـان لـه‌و ئافره‌تـه داوێـن پاکانـه‌ی لـه‌پێش هـاتنی ئـایینی ئیسـلامدا خـاوه‌ن پـه‌ڕاوێکی ئاسمـانی بـون (واتـه گـاورو جووله‌که) بخـوازن و لـه‌سـه‌ر ئـاینی خۆیشـیان بمێننـه‌وه..) ئایـا کاتـێ ئـه‌م ئایه‌تـه هاتـه خـواره‌وه ئــاینی مه‌ســیحی یــان جووله‌کــه؛ ئایینــه ڕاســته‌که‌یان مابوویه‌وه...؟ یان که‌س ئه‌یتوانی بزانێ که بنه‌چه‌ی ئه‌و گاور و جووله‌کانه‌ی کاتی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و، نیوه دوورگه‌ی عه‌ره‌ب ئایا باوو باپیریان جووله‌که یان گاور بون..؟ دیارییه ئایینه‌که‌یان هه‌ر وه‌کو ئێستا گۆڕا بوو، وه زانینی بناغه‌و بنچینه‌ی ئه‌وانه وه‌کو ئێسـتا وابـووه.. ئه‌مـه لـه لایه‌کـه‌وه له‌لایـه‌کی تـره‌وه سـه‌یری خێزانه‌کانی (نوح) پێغه‌مبه‌ر و (لوط) پێغه‌مبه‌ر ( سه‌لامی خوایان لێ بێت ) بکه‌و بزانه که خۆیان پێغه‌مبه‌ری خوا بون و (مرسل) بـون که‌چـی خێزانه‌کـه‌یان کـافر و خوانـه‌ناس بـون قورئـان ئه‌فــــه‌رموێ:** { ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ } التحريم: ١٠

واتە: خوا نمونە بۆ کافرو خوانەناسەکان ئەهێنێتەوە بۆ خێزانەکەی (نوح) پێغەمبەر و (لوط) پێغەمبەر، کە هەردووکیان خێزان و هاوسەری دوو بەندە لە بەندە چاکەکانی ئێمە بون..) کەچی کافریش بون. وە بە پێچەوانەی ئەمانیشەوە ئەفەرموێ:

{وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ }التحریم: ١١

واتە: خوا نموونە بۆ موسڵمانەکان و باوەڕدارەکان بە خێزانە موسڵمانەکەی (فرعون) ئەهێنێتەوە، فرعون کە هێمای هەموو ستەمکاران و ملهوڕانی مێژووە کەچی خێزانە خواناسەکەی (ئاسیەی کچی مزاحم) نموونەی ئافرەتی خواویست بوو..

کەواتە/ ئافرەت سەربەستە لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕو ئایین و، مێرد بۆی نیە بەزۆر بیروباوەڕ بسەپێنێ بەسەریدا.

٤. مافی ماڵداریێتی: لەو سنوورە تەسکەی ماڵداریێتی تاك (الملكیە الفردیە) کە ئیسلام ددانی پێدا ئەنێ بۆ پیاو، ئافرەتیش وەکو ئەو پیاوە (سەربەسەر) ئەو مافەی هەیەو ئەتوانێ خاوەن شت بێ و خۆیشی فەرمانداری ئەو شتانەی خۆیەتی بۆ کەس (مێرد، برا، باوك، هەر پیاوێکی تر) نیە بێ پرسی ئەم ئافرەتە بەکاری بهێنێ و ئەم ئافرەتە خاوەن شتە ئەتوانێ قەواڵە و پەیماننامە مۆر بکات و کەس ناتوانێ هەڵی بوەشێنێ. (أم هانی کچی أبو طالب) خوشکی (عەلی کوڕی أبو

طالب) خوا لە هەموويان خۆش بێ، زەوييەكی دابوو بە نيوەكار بە كابرايەكی بتپەرستی مەككەيی.. حەزرەتی (عەلی) پێی ناخۆش بوو هەڕەشەی كوشتنی كابرای كرد.. (أم هانی) ڕۆيشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ سكالای خۆی كردو فەرمووی: من پارچە زەوی و كێڵگەيەكم هەيە، داومە بە نيوەكار بە فلانە كەس، ئێستا عەلی برام هەڕەشە لە كابرا ئەكات..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی زەوی زەوی خۆتەو منيش ئەڵێم تۆ بە هەركەسی بدەی بەكرێ دراوەو (ئارەزووی خۆتە)[١٢١].

٥. مافی كاركردن و يەكسانی لەگەڵ پياو لە كرێدا: هەرچەندە شەريعەتی ئيسلام ژيانی ئافرەتی مسۆگەر كردووە.. ئيتر ئەو ئافرەتە، ژن بێ، يان كچ، دايك، خوشك.. ژيانی و پێداويستيەكانی ژيانی ئەركی سەرشانی پياوە.. لەگەڵ ئەوەيشدا بوێ هەيە كار بكات بەڵام بەسێ مەرج:

أ‌- گونجاندنی كارەكە لەگەڵ ئافرەتەكە، وەكو ئافرەت لەڕووی فەسيۆلۆجی و بايۆلۆجييەوە.

ب - پێويست بێ كار بكات.

ج - شەرەفی پارێزراو بێ و جێگای كاركردنەكەی لەناو پياواندا نەبێ.

---

[١٢١] – المراة بين البيت والمجتمع، ص٢٩٤.

قورئان چوارچێوەیەکمان لەبارەی کارکردنی ئافرەتەوە بۆ دائەڕێژێ لە بەسەرهاتێکی (موسی) پێغەمبەرەوەو ئەفەرمووێ:

{ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدۡيَنَ وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ قَالَ مَا خَطۡبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ } القصص: ٢٣

واتە: کاتێ موسی پێغەمبەر گەیشتە سەر ئاوەکەی (مەدیەن) سەیرێکی کرد کۆمەڵێ خەڵك ئاژەڵ ئاو ئەدەن، لەولایشەوە دوو ئافرەت دوور لەوان وەستاون و ئاژەڵەکانیان قەدەغە ئەکەن لەئاو خواردنەوە، موسی فەرمووی چیتانە..؟ بۆچی ئەو ئاژەڵانەی ئێوە ئەیانەوێ بڕۆن ئاو بخۆنەوە کەچی ئێوە ئەیانگێڕنەوە.. کچەکان وتیان ئێمە ئاژەڵەکانمان ئاو نادەین هەتا ئەو شوانانە (پیاوانە) نەڕۆن و سەر ئاوەکە (بیرەکە) چۆڵ نەکەن و ئێمە کچی پیاوێکی پیری تەمەن گەورەی بەساڵاچووی گەورەین.. لەم ئایەتە قورئانیەوە دەستمان ئەکەوێت...

١. ئافرەتەکانیان کاریان کردووەو کارەکەیش لە وزەی ئەواندا بووەو گونجاوە لەگەڵ سروشتی ئافرەتی ئەواندا .

٢. هەتا پیاوەکان ئەڕۆن ئەمان ئاوی ئاژەڵەکانییان نادەن بۆ ئەوەی تێکەڵاوی ناو پیاوەکان نەبن و شەرەفیان پارێزراو بێ.

٣. باوکیان پیاوێکی بەساڵاچووی پیرەو کەسیان نیە ئەو کارە بکات و پێویستە ئەمان بیکەن.

نموونەی ئافرەتی بازرگان و کرێکارو مامۆستاو پزیشك و... لە ئیسلامیدا زۆرەو لاپەڕەکانی مێژووی ئیسلامی پڕیەتی لە نموونە.. ئەوەیە لەو کارەدا کە ئافرەت کار ئەکات کرێی ژن و پیاو وەکو یەکەو هیچ جیاوازییەکیان نیە {لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ} النساء:٣٢.

واتە: پیاو هەر کاسبی و کارو پارە پەیدا کردنێکی هەیە هی خۆیەتی و کەس بۆی نیە لێی داگیر بکات هەروەها بە هەمان هەق و کرێی وەکو پیاو ئافرەتیش هەرچی پەیدا کرد بۆ خۆیەتی و کەس بۆی نیە لێی بسێنێ؛ (ئەم مافە کە ئێستا بە نیوە چڵی بۆ ئافرەت داوا دەکرێ چواردە سەدە چەرخ لەمەوبەر بە چاکترین و بەرزترین شێوە پێی دراوە.. دەچێتە کارگەو کێڵگەو بازاڕو فەرمانگەکان..)[١٢٢].

٦. (... هەشت دێڕ)

٧. مافی خوێندن و زانیاری

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ئەفەرموێ ( طلب العلم فريضة على كل مسلم و مسلمة) واتە خوێندن و گەڕان بە دووای

---

[١٢٢]- ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا، ل٥٢.

خوێندەواری و زانستدا ئەرکە ( نەك دروستە بەڵکو فەرزە لەسەر هەموو پیاوێکی موسڵمان و ئافرەتێکی موسڵمان ).. ئەوە هەزاران ئافرەتانی ئەدیب و شەرعزان و زانای تەفسیرو فەرموودەمان هەیە و پێویست بە هیچ بەڵگەیەك ناکات.

٨. مافی ڕاوێژو پرس و ڕا (شوری)

ئافرەت چ لەناو خێزانەکەی خۆیدا و چ لە کۆمەڵدا وەکو پیاو مافی ڕاو پرس پێکردن و ڕاوێژی هەیە { وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ } التوبة: ٧١.

واتە: پیاوانی موسڵمان و ئافرەتانی موسڵمان هەر یەکەیان سەرپەرشتیکەرو کاربەدەستی ئەویتریانە و فەرمان ئەدەن بە چاکەکردن و یەکتری ئەگەڕێننەوە لە خراپەکاری..

**بەهەشت:** ئەی کاکە گیان ئەوە چیە مەسەلەی کوردی ئەڵێ ژن، پرسی پێ بکەو بەگوێشی مەکە..؟

**نەوڕەسی:** خوشکێ گیان وا نیە.. پێغەمبەر ﷺ پرسی بە ئافرەت کردو بەگوێشی کردو کێشەی گەورەی موسڵمانەکانی پێ چارەسەر کرد..

لەپێش مۆرکردنی پەیمانی (حدیبیە) لەنێوان پێغەمبەر و قوڕەیشدا ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موسڵمانەکان بەنیازی (عمرە) کردنەوە هاتبون بەرەو مەککە کە گەیشتە سەر ئاوی

(حدیبیە) کافرەکان نەیانهێشت (عمره)کەیان بکەن.. ئەوەبوو پەیمانەکە مۆرکرا.. یەکەم بەندی ئەو پەیمانەیش ئەوەبوو کە ئەمساڵ موسڵمانەکان نەڕۆن بۆ مەککەو (عمره) نەکەن.. دیارییە پێغەمبەر و هاوەڵە بەڕێزەکانی هەموویان لە (إحرام)دا بون و چەند وشترو گا و گۆلێك و مەڕ و بزن . هەریەکە بەپێی دەسەڵاتی خۆی ـ هێنابوویان بۆ ئەوەی لە مەککەو لە ڕێی خوا (هدیی) سەری ببڕن.. ئەمانیش کە ئەگەڕێنەوە بۆ مەدینە و ئەمساڵ (عمره) ناکەن ئەبێ (إحرام) بشکێنن و دیارییەکانیان (ئاژەڵەکان) سەرببڕن.. پەیمان (حدیبیە) لە ڕوانگەی هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە زۆر وازهێنان و هاتنە خوارەوە (تنازلات)ی تێدا بوو.. بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە چاوی پێغەمبەرانەوە سەیری مەسەلەکەی ئەکرد ئەیزانی چەندە قازانجی کردووە.. ئەوی زیاتر هاوەڵەکانی پەست کرد بوو، ئەوە بوو کە ئەبێ ئەمساڵ نەڕۆنە مەککەو بگەڕێنەوە بۆ (مەدینە)ی پیرۆز.. لێرەدا پێغەمبەر ﷺ هەتا سێ جار داوای کرد لە هاوەڵەکانی کە سەریان بتاشن و ئیحرام بشکێنن و قوربانیەکانیان سەر ببڕن، بەڵام بە پێچەوانەی هەموو ژیانی هاوەڵەکانی هیچیان هەڵنەسان و نەیان کرد، پێغەمبەر ﷺ زۆر پەست بوو.. بە پەستی ڕۆیشتەوە بۆ ناو چادرەکەی خۆی و ڕۆشتە لای (أم سلمەی) خێزانی و

بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوەو فەرمووی چارە چییەو پرسی پێکرد (أم سلمه) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر پێت خۆشە بڕۆ دەرەوە لەگەڵ کەسدا مەدووە هەتا وشترەکەت سەرئەبڕی و ئەمجا بانگی سەرتاشێك بکە سەرت بتاشێ (ئیحرامەکەت بشکێنێ) پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە بەبێ دەنگ و بە دەستی خۆی وشترەکەی سەربڕی بانگی سەرتاشی کردو سەری تاشی.. کە یارەکانی ئەوەیان بینی یەکسەر هەڵسان و وشترەکانیان سەربڕی و کەوتنە سەرتاشینی یەکتری)[١٢٢] ئیتر کامەیە یاسای (ژن پرسی پێبکەو بەگوێی مەکە) بەهەشت گیان.

بەهەشت: کاکە گیان وا بزانم پێغەمبەر ﷺ داوای لە هاورێکانی کرد کە ئامۆژگاری دایکی موسڵمانان (عائیشە) وەربگرن.

نەوڕەسی: زۆر ڕاستە، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو نیوەی ئایینەکەتان لەو خاتوو (عائیشە) وەربگرن. لەوەیش گرنگتر (عائشە = دایکی موسڵمانان) بە هەزاران هەڵەی هاورێکانی پێغەمبەری خوای ﷺ ڕاست ئەکردەوە.. عائیشەی ئافرەت بۆی هەبوو لە گەورەترین هاوەڵی پێغەمبەرو پیاوانی سەدەی زێڕینی ئیسلام هەڵە بگرێ.. بۆ ئەوەی زانیاری عائیشە

---

[١٢٢]- ژیانی پێغەمبەر،١، ل٣٩٩.

خانت بۆ دەربکەویٔ بڕۆ کتێبی ( الأجابة لما أستدركته عائشة على الصحابة )کەی پێشەوا (زەرکەشی) بخوێنەرەوە.

٩. جا بەهەشت گیان ئێستا دێینە سەر مافی جنسی ئافرەت و هەڵبژاردنی هاوسەرو هاوژیینی و مافی هەڵبژاردنی مێردی:

أ. ئیسلام ، لە بەندو باوی ژنهێناندا یەکەم جار داخوازی داناوە..

داخوازی ئیسلامی مانای بینین و گفتوگۆی کچ و کوڕەیە و لە یەکتری گەیشتنیانە تەنانەت . لەگەڵ کەس و کاردا. بۆیان هەیە پێکەوە دانیشن پاش ڕەزامەندی هەردوولایان بڕیاری داخوازی ئەدەن (مغیرەی کوڕی شعبە) داخوازی ئافرەتێکی کردبوو بێ ئەوەی کچەکەی دیبێ تەنیا ناوبانگی بیستبوو.. هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی (چۆن نەتدیوەو داخوازیت کردووە) بەڵێ، فەرمووی دە بڕۆ ببینە، چونکە یەکتری بینین ئەبێتە هۆی پەیدابون و گەشەکردنی خۆشەویستی و سازاندن لەگەڵ یەکتری[١٢٤]. (بەڵێ سەیرکردن و یەکتری ناساندن، نەك دەست گەرم کردنەوەی ماوەیەك و وازهێنان).

[١٢٤]– تطور العلاقة الجنسية بين الرجل والمراة، ص٢٠١.

ب. عن أبي هريره (رضي الله عنه) أن رسول الله ﷺ قال (لاتنكح الأيم حتى تستأمر ولا تنكح البكر حتى تستأذن وفي البخاري عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله: أن البكر تستحي، قال ﷺ: رضاها صمتها)[١٢٥]

راتـه: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: هـەرگیز بێـوەژن مـارە نابڕرێت هەتا فەرمان نەدات بەو مارە بڕینە و هەرگیز کچیش مارە نابڕرێت هەتا ئیجازە و مۆڵەتی مارەبڕینەکە نەدات.

بەهەشـت: کاکە گیان تۆ وا ئەفەرمووی.. بەڵام ئێمەی کورد وەکو (شافعی) ڕێبازێك کێشەی (ولی مجبر).

واتە ئەو کاربەدەستانەکەی بۆیان هەیە بە زۆر کچ بدەین بە شوو ژنیش بۆ کوڕ بهێنن و پرس بە کەسیان نەکەن کۆسپە.. ئەوەتە مامۆستا ملا کەریمی مدرس لە شەریعەتەکەیدا ئەفەرموێ (وەلی لە - اصول - دا حەقی چەند شتێکی هەیە کە وەلییەکانی تر حەقی ئەوەیان نیە..

یەکەم: ئەوەیە ئەتوانێ کچی خۆی یان کوڕەزای خۆی منداڵ بێ یان باڵغە بێ، مادام بێوەژن نەبێ مارەی ببڕێ بێ ئەوەی کە داوای ئیزنی لێبکات. مەزهەبی شافعی وایە ئەگەر باوك و باپیرە داد پەروەربن حەقی مجبور کردنی کچیان هەیە کە شوو بکا بە

---

[١٢٥]- ماذا عن المراة، ص٥٨.

کەسێکی تایبەتی، چونکە خۆشەوستی و دادپەروەرییەکەیان مەیدانی ئەوە ناهێڵێتەوە کە مێردی خراپ بۆ کچەکەیان بدۆزنەوە، وە بەپێی مەسڵەحەتی ئەو کچە ئەیدەن بە شوو..)[١٣٦] ئەمەیش بووە داردەستێك بە دەستی هەندێ لە مەلاکانەوە بەناوی (ولی مجبور)ەوە بە زەبری خەنجەرو لێشاوی هەڕەشە هەزاران کچ بە زیندوویی لە ڕیزی مردودا بژین. ئەی وانییە..؟!

نەوڕەسی: خوشکێ گیان.. بۆ لێم تورە ئەبی خۆ من نە مەلام و نە کچیشم مارە بڕیوە.. جا ئێمە باسی ئیسلام ئەکەین یان باسی مەلا..

بەهەشت: ئەی مەلاکان بەپێی فەرموودەی پێشەواکانی (شافعی) نایکەن..؟

نەوڕەسی: نەخێر، ئەو مارە بڕینانەی تۆ باسی ئەکەیت نە بەپێی فەرموودەی پێشەواکانەو نە ئیسلامیش بەو مارەبڕینەو فرۆشتن و کچ بەپیرە ڕازییە.. با تێت بگەیەنم.

١. ئەڵێ (دادپەروەر) کە پیاویش داد پەروەر بوو کچ زیندە بەچاڵ ناکات و بێ دڵی خۆی نایدات بە شوو، دادپەروەر ئەبێ پێش هەموو کەس لەگەڵ ماڵ و خێزان و منداڵی خۆیدا دادپەروەر بێ، خۆ ئەگەر دادپەروەر نەبوو (ولی مجبر) نییە.

---

[١٣٦]– شەریعەتی ئیسلام، بەرگی سێیەم، ل١٧٧.

٢. ئەو مەرج و سنورانەی دانراون بۆ ـ دادپەروەری ـ مرۆڤ لە لایەکەوە و بۆ ( ولی مجبر ) لەلایەکی ترەوە، گەلێ گرانن لەم ڕۆژگارانەی ئێمەدا نایەنە جێ.. جگە لەوەی پلەی ژیری کچانی ئەمڕۆ بەهۆی خوێندن و پێشکەوتنی پلەی ژیرییانەوە زۆر چاکتر لە جاران ئەزانن خۆیان بۆ خۆیان مێرد بدۆزنەوە. یان کاتێ باوکی دۆزییەوە ئەزانێ چاکی و خراپی کوڕەکە چەندە.

٣. هاوشانیی (کفاءة) لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە (تەمەن، پلەی ڕۆشنبیری، پلەی کۆمەلایەتی،.. هتد..)

هەر هەموویان مەرجن، ئەگەر لەنگی لە یەکێکیاندا هەبوو، مارەبڕینەکە دانامەزرێت..[١٢٧]

٤. بۆ ئەوەی بزانی ئەو مەلایانەی کچ بەزۆر و لێدان بەشوو مارەی ئەبڕن نە ڕێبازی شافیعی و نە هیچ ڕێبازێکی تر ڕازی نیە هەر ئەو کتێبەی تۆ پەنجەت بۆ ڕاکێشا سەیری (ل١٧٨) بکە کە ئەفەرموێ (باوکێك کە بە بێ عوزرێکی شەرعی لەخۆیەوە بدا لە کچەکەی یان جنێوی بداتێ بەجۆرێك کە کچەکە کینەدار بوو بێ لێی، دروست نیە ئەو کچە بەبێ ئیزن بدا بەشوو، پێویستە ئیسپات کردنی ئەم جۆرە شتانە، لەپاش عەقدەکە زەحمەتەو کابرا بەناحەق بە درێژایی سالّ لەگەلّ ئەو ئافرەتە ئەمێنێتەوە).

---

[١٢٧] – هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٥. هەر لە ڕێبازی شافعیدا و لەو کتێبەدا ل١٧٩ ئەفەرموێ (یەکەم – ئەوەیە ژنەکە بەهۆی پیری یان نەخۆشی یان ناشرینی کابراوە تووشی ناڕەحەتی و دڵ پەرێشانی نەبێ) ئەگەر دڵ پەرێشان بوو . ئافرەتەکە . وا مارەبڕینەکە دانامەزرێ.

٦. باشە بۆچی تۆ تەنیا بۆ کچ بەشوودانەکە پێت ناخۆشەو سوور ئەبیتەوە ئەی نازانی (ولی مجبر) بۆ کوڕو بۆ کچ وەکو یەکە.

٧. ئەوەی کە باسمان کرد تەنیا بۆ ڕێبازی پێشەوا (شافعی)یە (خوا لێی ڕازی بێت) بەڵام خۆ لە ڕێبازی پێشەوای گەورە (الأمام الاعظم) (ر.خ) تەنانەت کچ ئەتوانێ پرسیش نەکات بە کەسی (نە باوك نە برا..) خۆی خۆی مارە ببڕێ لە یەکێ کە خۆی ئەیەوێ بە مەرجێك هاوشانی بێ.

٨. عن ابن عباس (رضي الله عنه) أن جارية أتت النبي ﷺ فذكرت أن أباها وهي كارهة فخيرها النبي ﷺ [128]

واتە: کچێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: باوکم مارەی کردووم لە فلان و خۆیشم حەز ناکەم شووی پێبکەم، پێغەمبەر فەرمووی (بڕۆ خۆت سەربەستیت ئارەزووت لێبوو شووی پێ بکە ئارەزووت نەبوو مارەبڕینەکە بەتاڵە..

[128]– رواه أبو داود ورجال اسناده ثقاة (ماذا عن المرأة، ص٥٧).

٩. وقد روى النسائي، أن فتاة جاءت الى النبي ﷺ فقالت: إن أبي زوجني إبن أخيه يرفع بي خسيسته، فجعل الأمر إليها. فقالت: قد اجزت ما صنع أبي ولكن أردت أن أعلم النساء أن ليس للآباء من الأمر شيء)[١٢٩]

واته: كچێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: باوكم مارەی كردووم لە برازایەكی خۆی هەتا پەستی و تێكشكاندنەكەی خۆی بە من پڕبكاتەوە.. پێغەمبەر ﷺ فەرمانی خۆی دا بە دەستی خۆی، واتە فەرمووی: خۆت خاوەنی خۆتی شووی پێ بكەی یان نا. كچە وتی: كەواتە من فەرمانەكەی باوكم هەڵناوەشێنمەوە.. بەڵام تەنیا مەبەستم ژنانە، كە بزانن لە مەسەلەی شووكردنیان باوكیان شت بەدەست نین..)

١٠. بۆ ئەوەی بزانی پێغەمبەر ﷺ چۆن ئافرەتی مارە بڕیوە گوێ بگرە (وفي حديث عقبة بن عامر (ر.ض) أن النبي ﷺ قال للرجل أترضى أن أزوجك فلانة، قال: نعم. وقال للمرأة أترضين أن أزوجك فلانا، قالت: نعم. فزوج أحدهما صاحبه)[١٣٠]

واتە كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بیویستایە ئافرەتێك لە پیاوێك مارە بكات – بە پیاوەكەی ئەفەرموو: ئایا تۆ ڕازیت و پێت

---

[١٢٩] – المرأة بين البيت والمجتمع، ص٢٩٦.

[١٣٠] الروضة الندية، ص١٤، ج٢.

خۆشە کە فڵانە ئافرەتت لێ مارە بڕم ـ پیاوەکە ئەیوت بەڵێ ـ دواییی ڕووی ئەکردە ئافرەتەکەو ئەیفەرموو: ئایا تۆش ڕازیت بەو پیاوە، پێت خۆشە لەو پیاوەت مارە بڕم ـ ئافرەتەکەیش ئەیوت: بەڵێ.. ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکتری مارە ئەکردن.

## ئافرەت لە چاوێلکەی فرۆیدەوە :

بەهەشت: کاکە گیان.. ئەگەر هەندێ پیاوی چاوچنۆك لەبەر بەرژەوەندی ڕابواردنی ئاژەڵی خۆیان ڕێزی ڕاکانی فرۆید بگرن.. ئێمەی کۆمەڵی ئافرەتان ڕەوا نییە هیچ نرخێکی بۆ دابنێین چونکە لای فرۆید (ئافرەت کەم بیرو ئەقڵ سووکەو ژیرییان کۆڵە لە ئاستی تێگەیشتن لە کاروباری ژیان) تەنانەت ئەڵێ (هۆی ئەم ژیرییە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی = الأنا العليا = ego super)ی ئافرەتان لاوازترە لە بەرزە منی پیاوان.. لەبەرئەمە ژیری ئافرەت و ویژدانی ئافرەت لە هۆش و بیری ئافرەت لاوازن.. لەبەرئەوە ئافرەت خۆی خاوەنی ڕای خۆی نیەو بەڵکو شوێنکەوتەو کاسەلێسی بیروڕای یان مێردەکەی یان هەر پیاوێکی ترە کە بتوانێ لاسایی بکاتەوە)[١٣١]

تەنانەت هێشتا بەو کەم ژیرییەی خۆمانەوە نامانهێڵێ ئەڵێ (کاتێ ئافرەت تەمەنی ئەگاتە (٣٠)ساڵان ئیتر هێز و وزەی بیرکردنەوەی لە گەشەکردن ئەوەستێ.. کەچی پیاو لەم تەمەنە بەولاوە دەست ئەکات بە گەشەکردن و فراوان بوونی بیرو هۆشی)[١٣٢] جگە لەوەی (ئافرەتی کردۆتە لانەی نەخۆشی

---

[١٣١]- الأنثى هي الأصل، ص١٤٢-١٤٣.

[١٣٢]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە ١٤٤.

شێتێتی و فێداری و هەستێری و هەموو نەخۆشییەكانی تری عەسەبی)[١٣٣] ئەمە ئافرەتە لە ڕوانگەی بیرو ژێری تیۆری فرۆیدییەوە.. ئیتر ئەبێ ئافرەتی ڕۆشنبیرو عەودالّی مافی ئافرەت چ دلّێك بە فرۆیدیزم خۆش بكات..؟!

نەوڕەسی: خوشكێ گیان ئەم مادییانە هەر هەموویان مرۆڤیان (وەكو مرۆڤ) لێ ون بووە.. هەروەها ئافرەتیش مرۆڤەو لێیان ونە.. ئافرەت لەو دیوی چاوێلكەكانی فرۆیدەوە بریتییە لە ئامێرێكی ڕابواردنی پیاوان.. ئافرەت ـ لای ئەوان ـ تەنیا بۆ خۆڕازاندنەوەی لەش و لارو سەما كردن و خۆپیشاندانی جنسی بۆ پیاوان و بزواندنی هەستی جنسی پیاوانە، (كینت ۆكەر) ئەلّێ: كاتێ كە ئەلّێن پیاوان ئافرەتیان نەناسیوە، مەبەستمان ئەوە نیە تەن و لەشی ئافرەتیان نەناسیوە یان چۆنێتی كاركردنی فەسیۆلۆجی و جنسی ئافرەتیان نەناسیوە بەلّكو مەبەستمان ئەوەیە پیاوان لە ڕوویەكی گەلێ لەوانە گرنگترو پڕ مەترسی تر ئافرەت ناناسن.. ئەویش، لایەنی مرۆڤایەتی ئافرەتەو ئافرەت وەكو مرۆڤێكی وەكو خۆی ناناسێت )[١٣٤]

---

[١٣٣] – ل٥٢ هەمان سەرچاوە.

[١٣٤] – المراة والجنس، ص١٧.

ڕاستە ئافرەت وەکو مرۆڤێکی خاوەن نرخی مرۆڤایەتی.. خاوەن شەرەف و هەستی ڕێز.. خاوەن.. ناناسن.. ئافرەت لای ماددییەکان بەگشتی و لای فرۆید بەتایبەتی:

بریتی یە لە کەلوپەل و شتومەکی کڕین و فرۆشتن.

بریتی یە لە بازرگانی بە دەست جوولەکەوە بۆ قازانج و دەست کەوتی ڕامیاری چەپەڵی خۆیان.

بریتی یە لە بوکەشوشەی دەست شەروالْ پیسان و خوێن مژانی شەرەف و کەرامەتی مرۆڤایەتی.

بریتی یە لە ئامێرو ڕابواردن و کات پێکوشتنی لە سۆزانی خانەکان و سەر شانۆی سەماگاکان.

بریتی یە لە یاری و دەسەمۆی پیاوان چەندی بیەوێ پێی ڕابوێرێ و دوایی (بای بای) لێبکات.

بەناوی ڕزگاری ئافرەتەوەو داوای مافی ئافرەتەوە کردیانە بەندەی جنسی و ئارەزووکاری خۆیان.

بەناوی مۆدێل و جونکاری ئافرەتەوە ڕووتیان کردەوە بۆ لێستنەوەی چاوی چاوچنۆکان لە هەر جێگایەك حەزیان لێیە.. شەقام.. بازاڕ.. قوتابخانە.. فەرمانگە.. تەنانەت، مەلەوانگە، هتد..

بەهەشت: زۆر زۆر ڕاستە کاکە گیان . بەڕاستی ئێمەی ئافرەت بووین بە مەیموون و عەنتەری سەماکەر بۆ ئێوەی پیاوان، کچ.. کچی داماو.. هەر لە منالیەوە فێر ئەکرێ کە لەم ژیانەدا هیچ کارو فرمانی نیە جگە لەوەی چۆن خۆی ڕێك و پێك بکا بۆ کوڕان، هەر بەیانی کە لە خەو هەلئەسێ هەتا کاتی شەو خەو ئەیبات بەلادا.. خەریکی قژی، جلەکانی، لێوی.. کولمی.. برۆی، برژانگی.. هتد، ئیتر مەگەر بە پەلە پڕوزێ کاتی خوێندنەوەو کۆششی دەست بکەوێ.. ئایا چەندە ئەم ئافرەتە داماوانە گیریان خواردووە بە دەستی ئەو یاسا نەفامییانەی دایان ناوە بۆ جوانی ئافرەت.. ئافرەت جوانە ئەگەر لوتی وا نەبێ، چاوی وا نەبێ.. دەمی وا نەبێ.. پاژنەی پێی وانەبێ.. برۆی.. برژانگی.. چەناگەی.. دەنگی.. ددانی.. هتد

ئەگەر ئافرەتێك نەختێك لووتی گەورە بێ، ئای لەم ناو کۆمەلی نەفامانەدا چەند هەست بە کەم و کوڕی خۆی ئەکات!!.

ئەگەر ددانی نەختێك گەورە بێت یان شاش بێ.. ئای چەند لەکاتی پێکەنین و زەردەخەنە پیش بەخۆی ئەخواتەوە.. زۆرجار خۆی ئاگای لە خۆی نیە دەستی فێر بووە دەمی و ددانی بشارێتەوە.. خۆزگە کاکە گیان تەزین و ماندووبون و گیرخواردنی ئافرەتە نەفامەکانت ئەدی لەبەر مێزو ئاوێنەی

میکیاجدا چەندە خەریکی بڕۆو بڕژانگ و سواغدانی دەم و چاوێتی.. ئەو ئافرەتەی تر خەریکە شەق ئەبات چونکە چەند دڵۆپە بارانێك یان بارشتێك قژەکانی تێك داوە.. سەری دنیای لێ دێتەوە یەك..[١٣٥]

نەوڕەسی: بەهەشت گیان ئافرەت بووە بە مۆری پڕوپاگەندە (إعلانات) و جاڕدان.. جاڕدانی هەموو شتێك.. پێڵاو وێنەی ئافرەتی پێوەیە.. جگەرە وێنەی ئافرەتی پێوەیە.. تەنانەت جل و بەرگی پیاوان.. تەنانەت فرۆشتنی پارچەی ئۆتۆمبیل و دەسەسڕی لووت سڕین و پێشاو.. وێنەی ئافرەت بووە بە مۆری پڕوپاگەندە[١٣٦].. لەمانەیش دڵتەزێن تر ئەوەیە ئافرەت کرا بە ئامێرێك بۆ ڕاوکردنی هەندێ پیاو و وەرگرتنی چەند ئاگاداری و تێبینیەك، بڕۆ سەیری هەزاران فیلمی (جاسوسی) بکە، ئافرەتێك بەهۆی لادانی گۆشەیەکی یەخەی دەرخستنێکی سووچێکی مەمکی یان وردە وردە هێنانە خوارەوەی زریزەی بلوسەکەی بەرامبەر پیاوێکی ڕامیاری و ئاگر بەردانە خەرمانی هۆش و ژیری و کڵپە سەندنی جنسی لەلایەکەوەو نەبونی باوەڕ بەخواو لێپرسینەوەی پاشەڕۆژ لە دڵی کابرادا لەلایەکی ترەوە ماڵی

---

[١٣٥] - هەمان کتێب و لاپەڕە ٥٤ سەیر بکە.

[١٣٦] - سەیری کتێبی (نزیکترین دەرمانخانە) ل١٥٩-١٦٠ بکە.

خۆی و گەلەکەی کاوول ئەکات و هەمانەی ڕامیارییەکەی چی تێدایە بۆ ئافرەتەکە ـ ڕاستتر بڵێین بۆ دوژمنەکانی گەل و نیشتمانەکەی . هەڵئەڕێژێ.

بەهەشت: سەرەڕای ئەمانە سەیر ئەکەی ئافرەت لە کۆمەڵگەی نەفامەکاندا نرخێکی تایبەتی بۆ دانراوە.. هەتا بەرەو تەمەن زۆری بڕوات ئەو نرخە دێتە خوارەوە تا لە ئەنجامدا کەس بە نانەسکێ و کارەکەریش نایەوێ.. خۆ ئەدەب و هونەری دەوری نەفامی هەر خەریکی لەش و لاری ئافرەت و ڕووت کردنەوەی ئافرەتە.. قژی پەخشانی، لێوی ئاڵی.. مەمکی قوتی بڕۆی قەیتانی.. هتد.. ئەڵێی ئافرەت لە لەش بەولاوە خاوەنی هیچ ڕوویەکی مرۆڤایەتی نیە.. لای نەفامەکان لە سەراسەری مێژوودا جوانی ئافرەت.. جوانی لاشەیەتی.. ئەگینا جوانی ڕەوشتی... جوانی بیرو هۆشی.. جوانی هەڵوێستە مرۆڤایەتیەکانی.. نرخی بۆ دانانرێ . ئەمە لای ئەوانەی داوای مافی ئافرەت ئەکەن و ئەکروزێننەوە بۆی.. تا لە ئەنجامدا ئا بەو شێوەیە ئافرەت بێ نرخ و سووک کرا..

ئافرەتێکی پەیامنێری گۆڤارێکی عەرەبی لە پاریسەوە باسی بێ نرخی ئافرەت لە ئەوروپادا ئەنووسێ و ئەڵێ (لە پاریسدا بۆڵە ترێیەك یان دەنکە چوالەیەك لە ئافرەت گرانترە..)[127].

ئەمەیە ئافرەت لای مادییەکان بەگشتی و لای فرۆیدیزم بەتایبەتی. دوا مۆدێلی سووکی ئافرەتی داماو ئەوەیە ( لە هەندێ یانەی قومارچییەکان ) کاتێ قومارچییەك ئەیباتەوە لەبری پارە، بە ئارەزووی خۆی ئافرەتێك . کچێک هەڵئەبژێرێ و ئەیبات بۆ خۆی و بۆ ڕابواردن نەك بۆ ماوەی شەوو دوو شەو هەتا خۆی بەرەڵلای ئەکات.. ئەم ئافرەتە ئەوروپییە لە سەدەی بیستەمدا خاوەنی هیچ ورتەیەك نیە[128]!!! بەلام ئافرەت لای ئیسلام خاوەن ڕێزە.. خاوەنی خۆیەتی (ما أكرم النساء إلا كريم وما أهانهن الا لئيم) پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ.. کەس ڕێزی ئافرەت ناگرێ جگە لە خاوەن ڕێزو کەس بە سووك سەیریان ناکات ڕژدو ناکەس نەبێ.. واتە، ئەو کەسەی ڕێزی ئافرەت بگرێ خاوەن ڕێزەو ئەو کەسەی بیانشکێنێ و بەسووکی سەیریان بکات ئەوە خۆی سووك و ناپەسەندە.. دوا ئامۆژگاری

---

[127]– گۆڤاری (حضارة الأسلام) ژمارە (٣) سالی (٩)-١٣٨٨ی ك ١٩٦٨ زاینی لا٩٧.

[128]– المرأة في ظل الحضارة الغربية، ص٩.

و وەسیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ موسڵمانەکان ( لە خوتبە بەناوبانگەکەی حەجیماڵئاوایدا) داوای چاکە کردن و ڕێزگرتن و داوای یەکسانی بون لەگەڵ ئافرەت.

کە ئەڵێین ئافرەت، ئافرەتی موسڵمان، مەبەستمان ئەم ئافرەتانەی ئەمڕۆ نیە.. ئەم ئافرەتانەی خۆیان . وەکو پیاوەکان تەنیا بەپێی سەرنووسەکانیان موسڵمانن. ئەگینا کام ئافرەتە موسڵمانە.؟ ئەو ئافرەتە موسڵمانەی کە دڵی و بەرگەکەی و شێوەی دەرەوەو ناوەوەی ئەوروپی و ئەمەریکییە نە کوردە نەموسڵمانە تەنیا بە کوردی ئەدوێ لەبەر ناچاری.. ئیتر کامەیە موسڵمان[١٣٩].. ئافرەتێك موسڵمانە شانازی بکات بە کەسایەتی خۆیەوە.. شانازی بکات بە نەریت و خووڕەوشتی بەرزی خۆیەوە.. کە وتی ئافرەتی موسڵمان واتە موسڵمانە، نە ئەمریکییەو نە ڕووسییەو نە ئەوروپی.. خۆی خاوەنی یاساو بەرنامەی تایبەتی خۆیەتی لە ژیانداو دەسەمۆی کەس نیە.

* * *

نەورەسی: خوشکە گیان لە کۆتاییدا و بۆ چەسپاندنی قسەکانی تۆی ژیرو موسڵمان فەرموو ئەو کتێبە بخوێنەرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە گۆڕەری کتێبەکە لەو فەریکە دکتۆرانەیە

[١٣٩]- سەیری کتێبی (الأسلام واتجاه المرأة المسلمة المعاصرة) بکە.

شـانازی بــە کاسەلێســی ئــەورروپاوە ئــەکات و لــە داوێنــی گۆڕینەکەیدا زۆر وشکە ڕنی ئەکات بۆ خوێنەرانی وەکو خۆی، بەڵام بەهەر حاڵ کتێبەکە ئافرەتێکی (دانیمارکی) نووسیویێتی و گـۆڕەر لـە زمـانی ئینگلیزییـەوە وەری گێڕاوەتـە سـەر زمـانی کوردی، ئەو ئافرەتە لەم کوردستانە خۆشەویستەی خۆماندا و هـەر لـە ناوچـەی خۆمانـەدا (دوکـان و سـەرکان و پێنجـوێن و هەورامان) لەناو ژنە موسڵمانە کوردەکانی لای خۆماندا ژیاوە بەڵام بزانی چی ئەڵێ.

**بەهەشت: ئەڵێ چی...؟**

**نەوڕەسی:** حەز ئەکەم هەموو کتێبەکە بخوێنیتەوە.. بـەڵام نـەك بەو شێوەیە کە گۆڕەر ئەیەوێ.. بەڵکو بەژیری و سەلیقەیەکی موسڵمانانە ودیاری کردنی ڕاستی لە کتێبەکەدا. بۆ نمونە ئەو ئافرەتـە دانیماریکییـە ئەورووپاییـە لـەژێر ناونیشـانی (ژنـانی موسـڵمان نـازدارن) ئـەڵێ (لـەناو موسـڵمانان ژنـان بەقیمـەتن، نازدارن، بەچاوێکی بەرز تەماشایان دەکرێ و دەپارێزرێت، ژنان پایەیـەکی بـە ئیمتیازیـان هەیـە، ئـەو پایەیـە کـە ئێمـەی ژنـانی سـەربەخۆ! سەربەسـتکراوی ڕۆژئـاوا لـە زووەکـەوە لـەبیرمان چۆتەوەو نایزانین..).

**بەهەشت**: زۆر ڕاست ئەکات کاکە گیان.. بەڕاستی تام و مەزەی ژن و پیاو لەوەدایە هەریەکە سنووری مرۆڤانەو ڕاستی خۆی بزانێ.. نەك ئافرەت خۆی بکات بە پیاو و، پیاو بە ژن..؟

**نەوڕەسی**: بەهەشت گیان گەشتەکەی ئەم ئافرەتە لەکاتێکدا بووە کە ئیسلام وەکو بەرنامەی ژیان نەماوەو لەناو خەڵکی ئەم کوردستانەیشدا وەکو تروسکاییەك لە دڵیاندا گڕاوە باو باوی بەگ و ئاغا و شێخ و چەند کۆلکە مەلایەکی نووشتەنووس بووە.. کەچی ئەورووپاو شارستانێتی ئەورووپا نەیتوانیوە تام و مەزەی دیوارە قوڕو ژیانە ساکارەکانی ئاوایی (سەرکان)ی کاول کراو ساڵی (١٩٥٧) پێ لێخن بکات و بەڕاستی ئافرەتێکی بەویژدان بووە کە ئەڵێ[١٤٠] ، ( لە پاشا ژنێ لە هیچ لایەکی دینا ناتوانێ بە سەلامەتتر لە وڵاتی ئیسلام بگەڕێ..) تا لە ئەنجامدا سەر ئاسوودەیی دڵ و دەروونی ئافرەتی موسڵمان باس ئەکات و ئەڵێ[١٤١] (ژنانی کورد کێشەی کات ڕابواردنیان نیە و وەك ئێمە (ژنی ئەورووپی) بیر لەوە ناکانەوە چۆن کاتی خۆیان بەسەر ببەن، ئەوان کاتی خۆیان بەخۆشی ڕائەبوێرن، هەر ئیشێك بە دەستیانەوە بێ درێژەی پێ ئەدەن. هەموو دەمێ مێشك و

---

[١٤٠]- هەمان سەرچاوەو ل١٩٠.

[١٤١]- هەمان سەرچاوەو ل٢٠٠-٢٠١.

دەمارەکانیان ڕەحەتەو حەساوەتەوە، چونکە فرمانەکانیان بەخۆی و لەسەرخۆ و بەبێ گرژ بونی دەمارو مێشك، بەسەر ئەبەن.. ئەم گرژبونەی کە هەندێ جار ئەبێتە هۆی نەخۆشی ئەعصاب و خوێن وەك پەستۆی خوێت (ضغط) و دڵ، ساوا و منالّەکانیشیان ئەم ژیانەیان پێ خۆشە.

کە گەڕامەوە دانیمارك لێیان پرسیم (ئەرێ خانم چۆن ئێوارەتان بەسەر ئەبردو ئەکوشت؟..) لە وەڵامدا ئەموت (ئێمە ئێوارانمان نە ئەکوشت، بە خۆشی ڕامان ئەبوارد دەمە تەقێمان ئەکرد بۆ ماوەیەك بێ دەنگ ئەماین میوەمان ئەخوارد چاییمان ئەخواردەوە جگەرەمان ئەکێشا، ئێمە هەستی ئەوەمان ئەکرد ژیان خۆشە لەبەرئەوە بەتام و لەزەت بەسەرمان ئەبرد).

زۆر ڕاست ئەکات بەهەشت گیان کامەرانی و خۆشگوزەرانی بە ئەورووپای پێشکەوتوو و کوردستانی دواکەوتوو نیە.. ڕەنگە ئەو ئافرەتە لادێییانە زۆر بەختیار تر بوو بن و خۆشتر ژیانیان بەسەر بردبێ لەوانی ئەورووپی.. حەز ئەکەم سەیری گۆڤاری (أسرتی) و ژماری (٣٥) و لاپەڕە (٥٠ـ ٥١) بکەیت کە باسی خەفەتباری دەوڵەمەندترین ئافرەتی جیهان و ملیۆنێرێکی ئەوێی

ئەکات و کە ناوی (کریستینا ئۆنامیس)ەو بێزارە لەو ژیانە[١٤٢] وە لە لاپەڕە (٥٧. ٥٨) ی کتێبەکەدا ئەڵێ:

(.. بەڵێ هەندێ جار ژنێکی ئەوروپایی وا دەزانێ ژیان لەژێر ئەم جۆرە دەستوورە (دەستووری خۆپۆشتن) لەناو ئەم ماوە تەسکە زۆر ناخۆشەو لە دڵی خۆیدا ئەڵێ.. نازانم ئەم ژنانە چۆن بەرگەی دەگرن! بەڵام کە چوویتە ناویان و لەگەڵیان ژیای ئەو کاتە تێدەگەی ژنی ئەوروپایی، کە بە ئازادییەکی خۆی دەنازێ، لەوان باشتر ناژی، لە ڕۆژئاوا ئەمە پەنجا ساڵە ئێمە خەریکی ئازادکردنی ئافرەتانین کە وەك پیاوان هەمان مافیان بدەینێ.. لەپاش چەند مانگ ژیان لەناو ژنانی موسڵمانا کە لای ئێمە بە چەوساوەو بەندکراو دەژمێررێن گەیشتمە ئەو بیرەی کە بڵێم (بێتو من پیاو بم ڕقم هەڵدەسێ لەناو ئەم جۆرە کۆمەڵەدا لە شاران بژیم، چونکە ژنان باش سوودیان لە دەستوورەکە وەرگرتووەو پیاوان تووشی زیان بون.. لە دێهاتی ئێرە خواوڕاستان ئافرەتان سەربەستترن ).

جا حەز ئەکەم کتێبەکە هەمووی بخوێنیتەوە.

بەهەشت: خوا یارمەتیم بدات هەر ئەمشەو دەست ئەکەم بە خوێندنەوە.

---

[١٤٢]- گۆڤاری (اسرتی) کوێتی ژمارە (٣٥) مانگی ت/١/١٩٨٢.

نەوڕەسی: ئەوەی کە باسمان کرد چارەسەرکردنی جنس و کێشەی جنسیە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە.. بێجگە لەم چارەسەرکردن و مافە جنسیانەی کە دراوون بە پیاو بە ئافرەت وەکو یەك.. بۆ ئەوانەی دەست درێژی بۆ ناموسی خەڵکی تر ئەکەن و سنوری نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ ئەشکێنن، ئەوانە ئیسلام سزای بۆ داناوون و هەریەکە بەپێی بارودۆخی کارە ناپەسەندەکەو پلەی پێویستی کارەکەو..هتد..

**خەو لە ڕوانگەی فرۆیدەوە :**

**بەهەشــت:** کاکە گیـان بڕیـارت وابـوو (بـە پشـتیوانی خـوای گەورە) ئەمشەو مەسەلەی خەو (خەوبینین)م لە ڕوانگەی لیخنی فرۆیدەوە بۆ باس بکەی.. بەڵام ئایا فرۆید جگە لە جنس و جنس بازی و داکەندنی دەرپێی ئابڕو و نامووسی مرۆڤایەتی چی تری زانیوە..؟

**نەوڕەسی:** خوشکە شیرینەکەم.. ڕاڤە کردنی خەوەکەیشی لە بۆچوونەکانی فرۆیدا هەر دەوری جنسی و مەسەلەی جنسیدا ئەسوڕێتەوەو پێیان ئەوترێ (تیۆرە سێکسییەکان لە ڕاڤە کردنی خەودا)[١٤٣].

**بەهەشت:** دەی کاکە گیان فرۆید ڕای چۆنە بەرابەر خەو و چۆن چۆنی ڕاڤەی ئەکات..؟

**نەوڕەســی:** بەهەشت گیـان.. خەو لە ڕوانگەی فرۆیدەوە یان ڕاستتر بڵێین ڕای فرۆید بەرابەر خەو:

١. خەو بریتی یە لە هێنانەدی ئارەزوویەکی خەفەکراو لە ڕۆژانی ڕابردوودا[١٤٤] یان بەلای کەمەوە وێنە گرتنەوەی ئەو ئارەزووە لە خەوداو خۆدزینەوەیە لە هۆش و ژیری و هەموو کۆتەکانی تر،

---

[١٤٣]- گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە (٨٩) ساڵی ١٩٨١، ل٦١.

[١٤٤]- مجلة كلية آداب، جامعة بغداد (٣٣)، آذار ١٩٨٢.

فرۆید خۆی لە خەویدا (زۆر تینوی بوو خێزانەکەی ئاوی لە گوڵدانێکدا بۆ هێناو خواردیەوە بەڵام لە خەوەکەیدا تیوێتیەکەی نەئەشکاو هەتا ئاوی زیاتر بخواردایەتەوە زیاتر تینوی ئەبوو.. کاتێ ڕاچەنی و لەخەو هەڵسا سەیری کرد، هەروایە تینویەتی.. ئەو گوڵدانەیش ئاوەکەی تێدا بوو، گوڵدانێکی زۆر بەنرخ بوو کاتێ خۆی فرۆید لە ئیتاڵیا کڕیبووی و لێی ون بوو بوو هەر ئاواتەخوازی دۆزینەوەی بوو[١٤٥]. واتە هێنانە دی دوو ئاواتی خەفەکراوی، تینوویەتی، گوڵدانە ون بووەکە.

٢. خەو، یان بریتی یە لە دەرخستنی ئارەزووی خەفەکراو یان بریتیە لە دەرخستنی ڕق و قینێکی کپ کراوە و هێنانەدی تۆڵەسەندن لە خەودا[١٤٦].. وەکو: کاتێ منالێك لە خەودا ئەبینێ گیاندارێکی درندە هێرشی بۆ دێنێ و، درندەیەك پەلاماری ئەدا.. ئەوە هۆی خەفە کردنی کۆنە قینەکەیەتی لە باوك و ئەم ڕقەبەرایەتیەش ئەگەڕێتەوە بۆ کاتی حەزکردن لە دایکی خۆی و خەفەکردنی ئەو حەزەو پەنگ خواردنەوەی خەشم و قینی لە

---

[١٤٥]- خلاصة علم النفس، ص١٥٦.

[١٤٦]- الأنسان بين المادية والاسلام، ص٣٢.

باوکی کە دایکی تەنیا بۆ خۆی داگیر کردووە. جا ئەو دڕندەیە کە لەخەوەکەدا ئەبینێ ئەو خەشم و قین و ڕقەیە[١٤٧].

٣. بەڕای فرۆید، چ ئارەزووە خەفەکراوەکەو چ خەشمە شاراوەکە جەمسەری هەموویان سێکسەو (خەو بریتی یە لەو ئارەزووە جنسیانەی کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا نەمانتوانیوە بیهێنینە دی وە زۆربەیش ئەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی منالّی. لەو کاتەدا ئارەزووەکانمان خەفە ئەکرد لەبەرئەوەی بە تاوانمان ئەزانی لە خەوەکانماندا ئەو ئارەزووە سێکسیانە دەرئەکەون و ئەمانەوێ لە خەودا بێنە دی[١٤٨] جا هەندێ جار هێنانەدی ئەو ئارەزووانە لە خەوەکەدا بە شێوەی ڕەمز دەرئەکەوێت.

٤. لای فرۆید بەتایبەتی و فرۆیدیزم و ماددیەکان بەگشتی خەو هیچ پەیوەندییەکی بە ڕۆژانی داهاتووی مرۆڤەکەوە نیەو هەموو خەوەکان چیرۆکی کۆنی ڕۆژانی ژیانمان و زۆربەی مێژوومان و جار جار ڕۆژانی ئێستامان بۆ باس ئەکات.. بەهیچ شێوەیەك فرۆیدیزم و ماددییەکان بڕوایان بە خەوی پێشبینی و پێش زانی (الاحلام التنبؤية) نیە[١٤٩] و لایان وایە کە (خەو هیچ شتێکی

---

١٤٧ - دراسات في النفس الانسانية، ص٩١.

١٤٨ - ڕۆشنبیری نوێ هەمان ژمارەو لاپەڕە.

١٤٩ - نظرية فرويد، دراسة وتحليل، ص٢٨.

سەیری تێدا نیە، چونکە خەوەکانیان تەنیا ئیشی ڕۆژانەی خۆیانەو ئەگەرچی بە شێوەیەکی زۆر سەرپێییش بێ یان بیریان لێ کردۆتەوە یان بیستوویانە..)[١٥٠] وە (خەو ڕووداوێکە و لە ڕابردوودا ئەگەر لە مێشکمدا بێت ڕووی داوە و هیچ پەیوەندییەکی بە داهاتووەوە نیە)[١٥١] وە وا ئەزانن هەرگیز ڕوونادات خەوێك ببینرێت و پەیوەندی بە ڕۆژانی داهاتووی مرۆڤەوە هەبێ[١٥٢].

٥. بەکورتی لای فرۆید خەو هەناسەدان و دەربڕینی ئارەزووەکانی ناو تۆ تۆی دەروون و حەزە خەفەکراوەکانە[١٥٣].. بەڵام بەهەشت گیان ئەوەیش بزانە مەبەستی فرۆید و فرۆیدیزم لە حەز و ئارەزوو تەنیا حەزی جنسی و ئارەزووی جنسی خەفەکراوە.. خەو (وەکو دیاردەکانی تری ژیانی مرۆڤ) تەنیا جنسەو بەس.. هەرچی شتی درێژ هەیە لە خەودا نیشانەی هەرامەی) پیاوەو هەمەو شتێکی پان و خڕ نیشانەی (هینی) ئافرەتە.. هەموو هەڵسوکەوتی خەو هەموو جوڵانەوەو جموجوڵێك، مەلەکردنن سواری کەرو ئەسپ و ماین و پاسکیل و

---

[١٥٠] – ڕۆشنبیری نوێ، هەمان ژمارە ل٦٤.

[١٥١] – هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[١٥٢] – سەیری (أسرار النفس) ص٣٩ بکە.

[١٥٣] – نظرية عامة في السيكولوجيا العلمية، ص١١٠.

سەیارەو فڕۆکەو ڕۆکێت تەنانەت فڕین لە خەودا.. هەر هەموویان نیشانەو هێماو ڕمزن بۆ جنس و کاری جنسی.. ئەگەر چاڵێك کەنێك لانەکەنێکت دی لە خەودا ئەوە ڕەمزە بۆ (هێنی) ئافرەت.. ئەگەر لە خەودا پێنوسێك دارتەلێك یان هەر شتێکی درێژت گرت بە دەستەوە ئەوە یاری بە هەرامەکەی خۆت ئەکەیت)[١٥٤]. نەك تەنیا فرۆید خۆی ئەوە ڕای بێ بەڵکو هەموو دێوڵە جووەکان ئەو ڕایانە هەیە کە (هەموو هەڵسوکەوت و شتێك کە لە خەودا ئەبینرێت جنسیەو لە جنس بەولاوە نیە..)[١٥٥].

ئەمەیە کورتەی ڕای فرۆید و فرۆیدیزم لە بارەی خەوەوە.

بەهەشت: ئەی تۆ ئەڵێی چی..؟ ڕات چۆنە..؟

نەوڕەسی: بەهەشت گیان هەموو ڕاو تیۆریەکانی فرۆید لە ئەنجامی وتوێژو هەڵسوکەوتی نەخۆشەکانی خۆی بەتایبەتی (هەستریا)دارەکان.. داڕشتووە.. بەڵام لە ڕاستیدا فرۆید خۆی لە نەخۆشەکانی نەخۆشتر بوو.. فرۆید خۆی نەخۆش بووە و دڵ و دەروونی گەنیوە.

١. بەهەشت گیان خەو بریتی یە لە ڕەنگدانەوەی ژیانی ڕۆژانەی ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی مرۆڤ، جنسیش وەکو چمکێك لە

---

[١٥٤] - الشیطان یحکم، ص٧٨-٧٩.

[١٥٥] - سەیری (اسرار النفس) ل٥٨-٦١ بکە.

ڕووبەری ژیانی مرۆڤ بەشی خۆی هەیە لە خەودا بەڵام نەك هەموو خەو هەر جنسە.. نەك دارتەل و قەڵەم و مەلەکردن و فڕین و هەموو هەڵسوکەوتێکی ئادەمیزاد هەر جنس بێ..ئەی بۆچی فڕین ڕەمز نەبێ بۆ بەرزێتی پلەی مرۆڤەکەو ڕزگاربونی لە کۆتەکانی ئارەزووی منالی و گەیشتنی ڕادەی ژیری..

٢. زۆرجار ( ئەبینین خەوەکانمان جنسی نیە بەڵکو زۆر جار خەوەکانمان ڕووداوێکی ساکاری و نادیاری ڕۆژانەی ژیانمانەو هەندێ جار لەیادمان نامێنێ)[١٥٦] جگە لەوەی کاتێ فرۆید ئەو ڕێبازەی داناوە زانستی فەسیۆلۆژی لە سەرەتای پەرەسەندنی بووە و پاش فرۆید دەیان زانای بەرزی فەسیۆلۆژی هاتن و هەڵەکانی فرۆیدیان ڕاست کردەوە وەکو (سیکنۆڤ)[١٥٧] و (بافلۆڤ)و هتد..

٣. ئەی نابێ هەرگیز مرۆڤ خەو ببینێ بە پاشەڕۆژی گەلەکەی و هۆی پێشکەوتن و سەرکەوتنی و هەرگیز نەبووە ڕۆژێ لەڕۆژان فرۆید یان مادییەکان لە خەویاندا لە کلپەی شۆڕشێکدا بووبن..؟ هەرگیز خۆیان لە خەوداو لەسەنگەردا نەدیوە..؟ هەرگیز لە خەودا نەیاندیوە بەند بووبن لەسەر مەسەلەیەکی نیشتمانی و

---

[١٥٦] – ڕۆشنبیری نوێ، هەمان ژمارە، لا ٦١١.

[١٥٧] – سەرچاوەی پێشوو.

تێکۆشانێکی ڕامیاری.. چۆن هەموو خەو هەڵسوکەوتیان هەر مەمك و لێوی ئاڵ و ژێر لێفەی جنسیە..؟؟!!.

٤. هۆی سەرەکی دژایەتی فرۆیدیزم و ماددیەکان لەگەڵ خەوی پێشبینی و پێشزانی (الأحلام التنبؤية) ئەوەیە ئەمانە بڕوایان بە وزە گەورەکەی مرۆڤ (گیان روح) نیە.. تەنیا باوەڕیان بە مرۆڤ هەیە وەکو تۆپەڵەیەکی مادی بێگیان.. خۆ ئەو وزەیەش کە بتوانێ لە کۆتی ڕۆژگار و شوێن (کات و جێگا = الزمان والمکان) خۆی ڕزگار بکات و پەلی بهاوێ بۆ پاشەڕۆژ و ئەودیوی مادده تەنیا گیانە.. جا ئەوان کە باوەڕیان بە گیان نیە.. حەقی خۆیانە باوەڕیان بە خەوی پێشبینیکەر و هەواڵی ڕۆژانی داهاتوو لەخەودا نەبێ..

٥. ئێمەیش لەگەڵ (فرۆیدیزم)ین کە خەوی پێشبینیکەر زۆر کەمەو بەدەگمەن ئەبینرێت و نابێ مرۆڤ هەر خەوێکی دی ئیتر نەخشەی ژیانی بگۆڕێ.. بەلام کەمی ڕوداوی خەوەکە مانای نەبونی نیە.. هیچ موسڵمانێکی تێگەیشتوو نیە خۆی بداتە دەستی خەو و بڕوای بە هەموو خەوێك هەبێ.. بەلام بڕوامان هەیە کە جار جارو زۆر کەم ڕێ ئەکەوێ خوا شتێك بە بەندەیەکی خۆی بگەیەنێ بەهۆی خەوەوە.. ڕەنگە ئەو بەندەیە ناموسڵمانیش بێ.. یان موسڵمان یان پێغەمبەریش بێ..

٦. ئێمە وەکو موسڵمانێك بڕوامان بە هەندێ خەوی پێشبینیکەر هەیە.. چونکە:

أ. هەندێ لەو خەوانە قورئان بۆمانی باس ئەکات، کە تەنیا ئەمە بەسە بۆ باوەڕ بون بەو جۆرە خەوانە ئەگەر چی زۆر کەمیش بن.

ب. خۆمان لە ڕۆژانی ژیانمانداو بەچاوی خۆمان لەو جۆرە خەوانە ئەبینین و بەدی ئەکەین و کەچی پاش ماوەیەك وەکو ڕۆژی ڕووناك دێتە دی.

٧. ئێمەی موسڵمانیش بڕوامان وایە کە زۆربەی خەو دیتنی خەڵکی هەناسەدان و دەربڕینی ئاواتێکی خەفەکراوە، بەڵام نابێ (لەبەر ئەوەی ماددیەکان لە وشەی گیان هەڵدێن و زراویان تۆقیوە ڕاستی پێشێل بکەین و ددان بە بونی هیچ خەوێکی پێشبینیکەردا نەنێین..

**بەهەشت:** کاکە گیان لەو بڕوایەدا نیم ئەگەر هەر مرۆڤێك بە وردی خەوەکانی لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەیدا بەراورد بکات لە هەموو ژیانیدا یەك خەو یان چەند خەوێکی پێشبینیکەر بەدی نەکات.. بەدی ئەکات ئەگەرچی زۆر کەمیش بێ.

**نەوڕەسی:** زۆر ڕاستە خوشکێ گیان.. وا لە خوارەوە چەند نموونەیەکی واقیعی لەو خەوانەت بۆ باس ئەکەم:

١. قورئانی پیرۆز و سورەتی (یوسف) و خەوەکەی (یوسف) پێغەمبەر.. کە ئێمە زیاتر لە بونی خۆمان بڕوامان بە ڕاستی قورئانی پیرۆز هەیە: {إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ} یوسف ٤-٥ ، واتە: یوسف وتی بە باوکی، بابە گیان بەڕاستی من لە خەومدا دیم کە یانزە ئەستێرەو مانگ و خۆر کڕنوشیان بۆ بردم و سەریان بۆ شۆڕ کردم.. باوکی (یعقوب) فەرمووی: ڕۆڵە گیان ئەم خەوە لای براکانت باس مەکە..) بۆچی..؟ چونکە یەعقوب پێغەمبەر (باوکی یوسف) بەو خەوەدا ئەیزانی ئەم خەوە مانای گەورەیی و پایە بڵندی پاشەڕۆژی یوسف ئەبەخشێت و مانای وایە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر یانزە براکانی و باوکی و باوەژنەکەی کڕنووشی بۆ ئەبەن. کەچی پاش ئەو هەموو ئەشکەنجەو سزایەی یوسف بەدەستی براکانیەوە چەشتی و دوواجار لە بەندیخانە دەرهات (چونکە وتی بە فرۆید درۆ ئەکەیت مرۆڤ با لە دۆخی مراهیقی و تافی لاوێتی و گەنجیدا بێ مەرج نیە هەر بیر لەکاری جنسی بکاتەوە بەڵکو زۆر جار بەندیخانەی بەوە پەسەندترە لە ڕابواردنی جنسی)[158] کە دەرهات لە بەندیخانە، خوا پایەی دایەو کردییە کاربەدەست و

[158]- قال رب السجن أحب الي مما يدعونني (ئافرەتەکان) اليه ، يوسف (٣٣)

عەزیزی میسر باوکی و براکانی بەتەواوی ئاتاج و کەلەلای بون و کاتێ هاتنە لای یوسف لە میسرو لەبەردەم تەختە (عرش)ەکەیدا ڕاوەستان هەموویان کڕنووشیان بردو لەو کاتەدا (یوسف) ڕووی کردە باوکی فەرمووی: { وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا وَقَالَ يَا أَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا } یوسف: ١٠٠

واتە: کاتێ باوك و براکانی یوسف هاتن بۆلای بۆ دیوان لەبەر ڕێزی باوکی و باوەژنەکەی تەخت (عرش)ەکەی خۆی بەجێهێشت بۆ ئەوان هەتا ئەو ماوەیەی لە دیوان دانیشتون لەسەری دانیشن و لەم کاتەدا باوکی و باوەژنەکەی و هەر یانزە براکانی کڕنووشی ڕێزیان برد بۆ یوسف یەکسەر یوسف فەرمووی بە باوکی: بابە گیان ئەمە مانای خەوەکەیەو خوا بەڕاستی گێڕاو هێنایە دی..)[١٥٩].

٢. لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ) لەخەودا بینی کە (خۆی و کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی بەخۆشی و بێ شەڕو شۆڕ چوونە ناو شاری (مەککە)ی پیرۆزە (طواف)ی کەعبەی بەڕێزیان کرد و هەندێکیان سەریان تاشی و هەندێکی تریان قژیان کورت کردەوە..) پێغەمبەر ﷺ ئەم مژدە خۆشەی دا بەو موسڵمانانەی دڵیان پڕ بوو لە تامەزرۆی (مەککە)و

---

[١٥٩]- سەیری تەفسیری نامی (٤) ل٣٥٩-٣٦٠ بکە.

دیداری (کعبە)[١٦٠] بەڵام ئەوەمان لەیاد نەچێت خەوەکەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ بەدی هاتنی ئەم خەوەی دیاری نەکرد، بەم شادییەوە پێغەمبەر ﷺ کەوتنە ڕێ بۆ حەج و بەرەو (مەککە) هەتا گەیشتنە ئەو جێگایەی پێی دەڵێن (حدیبیە) لەوێ کافرە قوڕەیشییەکان بەرەنگاریان بون و نەیانهێشت حەجەکەیان بکەن و پەیمانی (حدیبیە)ی بەناوبانگ مۆرکراو موسڵمانەکان بە دڵشکاوی گەڕانەوە بۆ (مدینە)ی پیرۆز..

بەڵام خەوی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبێ بێتە دی، کەچی هەر وابوو لە ساڵی داهاتوودا (ساڵی حەوتەمی کۆچی) پێغەمبەری خوا بەخۆی و کۆمەڵێ لە هاوڕێکانییەوە چوونە ناو (مەککە)و بەبێ هیچ ناخۆشییەك وە چۆن لە خەوەکەدا دیبووی و گێڕابوویەوە بۆیان.. بەو جۆرە حەجیان کردبوو خەوەکەی هاتەدی.. لەم کاتەدا ئایەتی پیرۆز هاتە خوارەوەو مانای خەوەکەی پێغەمبەری فراوانتر کردو بەو بەدی هاتنە قایل نەبوو

{لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾} الفتح

---

[١٦٠]- حياة محمد ل٣٦٥.

واتە: بەڕاستی خوا خەوەکەی پێغەمبەری(ﷺ) بەڕاست گێڕاو هێنایە دی و ئا بەو شێوەیە ئەڕۆنە ناو مزگەوتی (کەعبەی پیرۆز) ئەگەر ئارەزوو بکات بە ئاسایش و بێ شەڕ و شۆڕ وە هەندێکتان سەرتان ئەتاشن و هەندێکی ترتان کورتی ئەکەنەوە بێ ترس و حەپەسان.. ئەوەی کە خوا ئەیزانێ . لە دواخستنی هاتنی پارتان بۆ ئەمساڵ ـ ئێوە نەتان ئەزانی، کە خوا جگە لەمە، سەرکەوتن و دەسکەوتی نزیکترتان دەس ئەخات[١٦١]...) ئەم ئایەتە ـ سەرەڕای بەدی هاتنی خەوەکەی پێغەمبەر(ﷺ) وەکو ڕۆژی پاك= مانایەکی تر و گەورەتر ئەبەخشێ، ئەبێ ئەو سەرکەوتن و دەستکەوتە چی بێ..؟

بە ماوەیەکی کەم دوای ئەم مژدە خۆشە خوا گەنجینەو دارایی جوولەکە ناپاکەکانی (خەیبەر)ی بە میراتی بۆ نادرن.. بۆ ساڵی داهاتوو سەرکەوتنی چاوەڕێ نەکراوی گەورە هات کە پاك کردنەوەی (مەککە)ی پیرۆز بوو بەبێ خوێن ڕشتن و بە ئاسانی.

٣. هەر (یوسف) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) و خەووی دوو هاوڕێ بەندەکەی ناو بەندیخانەی و خەوەکەی پاشای میسرو داهاتنی گرانیەکە.

---

[١٦١]– سەیری (فی ظلال) بەرگی شەشەم ل٣٣٢٩–٣٣٣١ وە (التفسیر الکاشف) بەرگی حەوتەم ل١٠١ بکە.

٤. مامۆستایەك لەم بارەوە ئەفەرموێ (ئەگەر بڕوا بە هیچ شتێك لەم بارەوە . خەو بینینی پێشبین ـ نەکەم، ناتوانم بڕوا بە بەسەرهاتێکی خۆم نەکەم ئەویش ئەوە بوو، لەو کاتەدا کە لە . ئەمەریکا ـ ئەمخوێند . لە خەومدا خوشکەزایەکی لاوم خوێن بەرچاوی گرتبوو خوێنەکە نەیئەهێشت شت ببینێ..) نامەیەکم نووسی بۆ کەس و کارم . لە میسر. و بەتایبەتی پرسیاری چاوی ئەو خوشکەزامە کرد، پاش ماوەیەك وەڵامی نامەکەم هاتەوە کە (چاوی خوشکەزاکەم تووشی خوێن بەربونی ناوخۆیی (نزیف داخلی) بووەو بەردەوامە لەسەر چارەسەر کردن.. لەگەڵ ئەوەدا کاتێ چاو تووشی خوێن بەربونی ناوخۆیی ببێ لە دەرەوەی چاوەکە دەرناکەوێ و بە ڕواڵەت چاوی هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە کەچی خەو ئەو خوێنەی لەو قولایی ناو گلێنەدا و لەو ماوە دوورو درێژەدا . ئەمەریکا بۆ میسر. دەرخست[١٦٢].

**بەهەشت:** ئەی کاکە گیان تۆ دەستەکەی حاجی حسێن ـ حسینی ئایشت نایەتەوە بیر..؟

**نەورەسی:** کامە..؟

---

[١٦٢]- في ظلال، ج(٤) حاشية ص١٩٧٢.

**بەهەشت:** چۆن زۆربەی . سیدصادق ـ ی ئاگایان لەو خەوەی کاک حسین هەیەو مامۆستا شارەزووریش لە خوتبەیەکی هەینی داو لەسەر دوانگەی مزگەوتی گەورە باسی کرد.

**نەورەسی:** رەنگە کاتی پشووی هاوین بوو بێ کە من جار جار ئێوەم بەجێ ئەهێشت و ئەو مەسەلەیەم نەبیستبێ!!

**بەهەشت:** ئەم کاک (حسین)ە کە سید صادقی پێی ئەڵێن (حسین ی ئایش) و دووکانی کووتاڵ فرۆشتنی هەیە لەسەر سووچی دوکانەکانی بەرابەر مزگەوتی گەورەی سید صادق.. ئەم کاک (حسین)ە زامێکی بچکۆلانە لەسەر دەستی راستی دەرهات.. چەندە ئەمسەرو ئەوسەری پزیشکەکانی سلێمانی و خەستەخانەو ئەجزاخانەکانی ئەکرد زامەکەی تا ئەهات وردە وردە گەورە ئەبوو.. هەتا مەترسی لێ نیشت و رۆیشت بۆ بەغدا بەهیوای پزیشکێکی شارەزاتر لە نەخۆشییەکانی پێست.. بەچەند مەڵهەم و داو دەرمان چار نەکراو زامە رووبەری دەستی گرتەبەر و دەست و مەچەك سوور بونەوەو ئاوسان، لە ئەنجامدا هەندێ پزیشك وتیام: برا ئەم نەخۆشییە چارەسەر ناکرێ بە دەرزی و دەرمان جا بۆ ئەوەی لاشەت نەگرێتە بەرو بەرەو ژوور نەڕوات پێویستە دەست لە دەمی مەچەکتدا ببڕینەوە.. کاك حسین کە زانی چارە نیە دەست بڕینەکە نەبێ.. بە وتەی

پزیشکەکان قایل بوو چووە لای (د.عبدالرحمن الصالحی) کە لە بەغداو لە شەقامی (رشید) و بەرامبەر (بانقی مەرکەزی) دائەنیشت و ژمارەی تەلەفۆنەکەی (٨٨٨٤٤٢٥) بوو، پاش دوا بڕیاری بڕینەوەی دەست، بڕیاردرا ڕۆژی ١٩٧٩/١١/٢٠ دەستی کاك حسین ببڕنەوە..

**نەوڕەسی:** ئێ ئێ ئەی دوایی..؟

**بەهەشت:** دوایی کاك حسین لە بەغدا گەڕایەوە بۆ (سید صادق)و چاوەڕێی هاتنی ڕۆژی ١١/٢٠/ی ئەکرد و لەناو لێشاوی خەفەت و مەراقی دەست کوڵیدا ئەتلایەوە.. شەو زیاتر خەفەتی ئەخواردو بیری لێ ئەکردەوە هەتا شەوێك خەوی دی.. وەکو بۆ مامۆستا و بۆ خەڵکی تری ئەگێڕایەوە ئەیوت (بەو خەفەت و مەراقەوە شەوچەرەم ئەکردو سەرم ئەخستە سەر سەرین.. شەوێك لە خەومدا وام زانی لە ئاوایی (قوماش)ە وە ئەڕۆم بۆ ئاوایی (تاسڵوجە)[١٦٣] کە گەیشتمە دووڕیانەکەی (تاسڵوجە، سەراو) هەستم بە ماندوێتی کردو دانیشتم پشوویەك بدەم، لە خەوەکەمدا هەر لە مەراقی دەست بڕینەوەکەمدا ئەژیام.. سەیرم کرد هەندێ توێکڵە شووتی لەسەر ڕێگا کە

---

[١٦٣] - قوماش و تاسڵوجە، دوو گوندن لە شارەزوور کەوتوونەتە خوارووی خۆرئاوای (سید صادقەوە) کاك حسین لە بنەڕەتدا خەڵکی ئەوێ بوو.

کەوتووە.. هەر لەخۆمەوە هات بە دڵمدا وتم ئەوە بۆچی من ئەم توێکڵە شووتیە نەسوتێنم و بیخەمە سەر ئەم زامە بەڵکو خوای گەورە بیکاتە هۆی چاك بونەوە ڕزگار بونم.. هەر لە خەوەکەمدا ئاگرم نا بە توێکڵە شووتیەکانەوەو سوتانم و خۆڵە مێشکەیم خستە سەر برینەکەم.. لە خەوەکەمدا سەیرم کرد زامەکەم بەرەو چاك بونەوە ئەڕوات، لەم خۆشییەدا بەئاگا هاتم و خەبەرم بوویەوەو نیوە شەو بوو، بانگی خێزانەکەم کرد هەڵسا و خەوەکەم بۆ گێڕایەوەو وتم ئا دەی بزانە شوتیمان هەیە توێکڵەکەی لێ بگرەوەو بیخە تەنووری تەباخەکەوە.. ئەو شەوە ئەو خۆڵەمێشەم خستە سەری و چەند ڕۆژێك بەردەوام بووم لەسەری، کەف و کوڵی زامەکەم نیشتەوەو ئاوسانەکەی نەماو وردە وردە ڕووبەری زامەکە کەمتر ئەبوویەوە هەتا کاتی ڕۆیشتن و خەستەخانەکەی بەغدا هات بووە زامێکی ئاسایی زۆر بچووك.. کاتێ چوومەوە لای دکتۆرەکەو سەیری زامەکەی کرد واقی وڕماو بەسەرسامییەکەوە وتی ئەوە چۆن دەستت وای لێهات و چوویتە لای دکتۆر..؟ وتم: وەڵڵا نەچوومەتە لای هیچ دکتۆرێکی تر . لەو کاتەوە ـ و بەسەرهات و خەوەکەم بۆ گێڕایەوە..) پاش چەند ڕۆژێك هەر بەو خۆڵەمێشی توێکڵە

شووتیە بەتەواوی دەستم چاك بوو.. ئێستا وەكو هەموو كۆنە زامێك جێگاكەی دیارییە..).

نەوڕەسی: لای ئێمەی موسڵمان ئەمە كارێكی ئاساییەو بۆ پزیشكی گەورە ـ خوا ـ هیچی تێ ناچێ.

نەوڕەسی: شتێكی ئاشكرایە خەو دوو جۆرە:

١. خەوی (هاشەو پاشە) واتە بێ سەرو بن (إضغاث أحلام) كە ئەمە زۆرترینی خەوەكانی مرۆڤەو بە بچوكترین تێكچوونی دیاردەیەك لە ژیانی مرۆڤدا ئەم جۆرە خەوانە ئەبینرێت.. برسی بێ، یان شەو زۆر بخواو بەسەریان بخەوێ، جێگای نووستنەكەی كۆسپاوی و ناخۆش بێ، كاتی نوستنەكەی گەرمای بێ یان سەرمای بێ.. ئەمانە و هەزاران شتی تری ڕۆژانە كاریگەرن بۆ ئەوەی مرۆڤ خەوی هەڵەق و مەڵەق ببینێ.

٢. هەندێ خەو هەیە پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەوە نیەو یان یادخستنەوەی ڕابردوویەكی لەیادچووە یان شتێكی نادیارە لەو مرۆڤەوە بە خەو سەرە گوریسێكی بۆ دەر ئەكەوێ.. یان مژدەیەكی (خۆش یان ناخۆش)ی پاشەڕۆژە.. ئەم جۆرە خەوانە زۆر كەمن و جار جار مرۆڤ لە ژیانیدا بە دەگمەن ئەیبینێ.

بەهەشت گیان مەبەستمان لە چەسپاندنی ئەم جۆرە خەو بینانە ئەوەیە پەیوەندی نێوان لاشە (تەن) و گیان ناپچڕێ و مرۆڤ تەنیا لاشەی ڕووت نیە بەڵكو مرۆڤ لاشەو گیانە.. ئەگینا مەبەستمان ئەوە

نیە، ئادەمیزاد بڕوای بە هەموو خەوێکی پیرێژنانە هەبێ، هەر شەو خەو ببینێ و بەیانی بڕواتە لای فاڵچیەکی ساختەچی و کۆڵێنانییەك و هەزاران خەو بڕژێنێ درۆو دەلەسەی بۆ بکات و هەزاران کۆسپی بۆ دروست بکان لەڕێی ژیانیدا (بێگومان ڕاڤەکردنی خەو بەو شێوە ئایدیالیەی لە نێوانماندا تەشەنەی کردووە زیانێکی زۆرمان پێ ئەگەیەنێ چونکە زۆرجار خەڵکی کە خەو ئەبینن و ئەیگێڕنەوە بۆ یەکتری ئەو کەسەی ڕاڤەی ئەکات زۆرجار کارەساتی ناخۆش لە خەوەکە دروست ئەکات و وای بۆ دەر ئەبڕێت کە ئەو کارەساتە ناخۆشانەی تووش ئەبێ، چونکە خەوەکە ئیشارەتی ئەو کارەساتانەی تێدایە.. ئەمەیش ئەبێتە هۆی نەسرەوتی، مەترسی خاوەن خەوەکە بیرکردنەوەی لەو کارەساتە ناخۆشەی بەسەریا دێت، وە دوور نیە ئەو نەسرەوتییە تووشی نەخۆشی بکات، هەر وەکو چەندان جار ڕووی داوە..)[١٦٤].

---

[١٦٤]- گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ٨٩، ١٩٨٢ ل٦٥.

## خێزان لە ڕوانگەی فرۆیدییەوە :

بەهەشت: جا ئەمڕۆ ـ کاکە گیان ـ دێینە سەر سەرنجدانی خێزان لە دوودەری و چاوێلکەکانی فرۆیدەوە، بەڵام پێشەکی، ئەگەر هەر کوڕێك بەسەر دایکیەوە بە مێبازی دایکیەوە گۆش کرابێ و هەر کچێك دەنکی باوکەکەی بێ و هەر کچە بە چاوی دوژمنایەتی و ستەمکارییەوە سەیری دایکی بکات . چونکە باوکی لێ زەوت کردووە ـ و هەر کوڕەیش کۆنە قینێکی لەگەڵ باوکیدا هەبێ ئەبێ ئیتر چاوەڕێی چی بکەین و لە فرۆید و فرۆیدیزم بەرابەر خێزان؟!

نەوڕەسی: زۆر ڕاستە خوشکێ گیان لای فرۆید (کوڕ، قینی لە باوکێتی.. کچ ڕقی لە دایکێتی.. ژن دژی مێردەکەیەتی حەز بە مردنی ئەکات.. مێرد، ژنەکەی تەوقەو لە ملیەتی خوا خوای ڕزگار بونێتی و لە دەستی.. تەنانەت ئەو گریان و شین و شەپۆڕو قوڕپێوانەی کە بەسەر مردووەوە ئەیکەن، ئەوە دڵگرانی نیە بۆ لەدەس دەرچوونی خۆشەویستێکیان، بەڵکو ئەو گریانە پێشوازی کردنی خۆش ڕزگاربونیانە لەو زەلامەی کە ئاواتە خوازی مردنی بون و وا مردو ئاواتەکەیان هاتە دی..)[١٦٥].

---

[١٦٥] - کتێبی (Totam & Tabow)ی فرۆید ل٥٠-٦٠ لە کتێبی الأنسان بین المادیة والاسلام ل٣٦.

جا زانایەك لەم ڕوانگەوە سەیری خێزان و ئەندامەکانی خێزان بکات و ئەمە ڕای بێ ئەبێ ئیتر چاوەڕێی چی لێبکرێت دەربارەی خێزان..؟!

لای فرۆید بەتایبەتی و لای ماددییەکان بەگشتی خێزان شتێکی سروشتی نیە لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵکو ماڵ و خێزان تەنیا کاری جنسی و ئارەزوو شکاندنی تامەزرۆیی جنسییەو بەس.. ئافرەت کاتێ سەربەستی تەواوی وەرگرتو و لە کۆت و پێوەندی خێزان و خۆپەرستی پیاو ڕزگاری بوو.. ئیتر بەندو تاپۆی تاقە پیاوێك نابێ بەڵکو سەربەستەو هەر شەوەی بۆی هەیە لە باوەشی پیاوێك و (دڵدارێك) ڕابوێری و شەوی دوایی لاوێکی تر کە لە ڕێگا یان لە چێشتخانەکەی شەقامی فلانی یان لە دائرە ناسیوێتی شەوەکەی بەسەر بەرێ و.. کەس ناتوانێ پێی بڵێ.. نابێ وا بکەی.. ئەبێ شوو بکەی.. ئەبێ خێزان و خاوەنی ماڵ و منداڵ بێت.. نا، نابێ وای پێ بوترێ چونکە سەربەستی ئابووری وەرگرتووەو دەست خواری پیاو نیە و پیاو بۆی نیە یاسای دروستکراوی خێزان و ڕەوشت و ئایین و هتد.. ئەمانە هەمووی دۆخ و بارێکی ئابووری دروستی کردون، ئەمڕۆ باری ئابووری لە سەراسەری جیهاندا گۆڕاوەو ئەبێ ڕەوشت و ئایین و خێزان بگۆڕرێت.. ئەو یاسا سەربەستی ئابووری داوە بە

ئافرەت و لەلارەملێی جزدانەکەی پیاو ڕزگاری کردووە ئەبێ لە خێزان و کۆتی خێزانیش ڕزگاری بکات.. هتد..

**بەهەشت:** شتێکی ڕوونە کاکە گیان لای ماددییەکان ماڵ و خێزان جۆرە کۆت و بەندیخانەیەکەو ئەو ماڵ و خێزانەی لای خۆمان نیە کە بریتی بێ لە جێگای پشوودانی دەروونی و پەیوەندی گیانی نێوان ئەندامانی خێزانەکە، جا پاش ئەوەی ئافرەتە دەیان دەنگ ئەگۆڕێ کوڕەیش هەروەها . بۆ ئەوەی ڕێی لە هاوسەرو هاو جووتی پڕ بەپێستی خۆی بکەوێ هەریەکەیان ڕێی لەوی تر ئەکەوێ و (پاش ماوەیەك ژن و مێردی لا کۆلان) ژن و مێردی .ڕەسمی ـ بلاونەکەنەوەو .شوقەـ یەك ئەگرن و هەریەکەیان لە ماڵی باوکی جیائەبێتەوەو ماڵێکی تازە و خێزانێکی تازە (بەناو) دروست ئەکەن..

**نەوڕەسی:** جا چۆن خێزانێك..!! ئەو کوڕە برسیە جنسییە دڵدارە بۆ ئەو کچەی ڕووبەری دڵی دیاری کردووە لەسەر بنچینەیەکی جنسی ڕووت هەموو دڵدارییەکیان بە چوونە سەر جێگای ژن و مێرد بە با ئەدرێ، چونکە پەیوەندییەکی جنسی ڕووتە پەیوەندی لەشە لەگەڵ لەش، بۆیە دوای تێر خواردنی جنسی و یەکتری لێستنەوە ماڵەکە . کە هەر لە سەرەتاوە وەکو ئوتێلێك تێیدا دانیشتوون ئەبێتە لانەی شەڕو شۆڕ، ئەبێتە

بەدیخانەیەك و دوو كۆنە دڵداری تێر خواردو لە یەكتری و ڕەخنەگری ئێستای یەكتری تێدا بەندە.. ئەمە ئەگەر بیانەوێ خێزانی - ڕۆتینی - دروست بكەن، بەڵام ئایا نەزانی ئافرەت و كاری جنسی بێ سنوور زۆر گەنجانی هەڵناوە. لە كوڕو كچ كە واز لە ژنهێنان بهێنن و لەو تەوقە خۆیان لادەن.

بەهەشت: ئەی چارە ڕەشی بۆ ئەو منالانەی لەم خێزانەدا پەیدا ئەبێ..!!

نەوڕەسی: منالْ.. منالْی كلۆلی بێ بەش لە بزەو بەزەیی باوك و دایك و پەروەردەی دایەنكاری (دار الحضانة) و باغچەی ساوایان و.. ئەو منالْەی كە فرۆید زوو بە باوك و دایكی وتوون (نابێ باوك و دایك زۆر منالْەكەیان ماچ بكەن و خوویان بدەنێ بۆ ئەوەی زوو هەستی جنسیان گەشە نەكات..)[166].

ئەو منالْەی كە دایك و باوكی نەك تەنیا سەرمەشقی جنسی و بەدڕەوشتیان فێر ئەكەن بەڵكو بەهۆی ئەوانەوە تووشی كاری جنسی نا ئاسایی (الشذوذ الجنسی) ئەبن[167].

ئیتر فرۆید و فرۆیدیزم چییان نووسیوە لە سەر خێزان و چی كوڵك و موویەك شی كراوەتەوە لەم مەبەستانە دەرناچن.

---

[166] – الجنس عند فروید، ص١٢٣.

[167] – سەیری كتێبی (ثلاثة مباحث في نظرية الجنس) ل٢١ (پەراوێز) بكە.

**بەهەشت: ئەی تۆ ڕات چۆنە و چی ئەڵێی..؟!**

**نەوڕەسی: من ئەڵێم:**

**١. هەر هەموو ئەو فەیلەسووف و زاناو یاسا و ڕژێمانەی دژی پێك هاتنی خێزان و یاسای خێزانی بون، هەموویان دواجار لە ڕاکانیان پەشیمان بونەتەوەو دواجار یان بێدەنگ بووەو یان دەستی داوەتە هاندان و بانگ کردنی خەڵکی بۆ ژیانی خێزانی و چەسپاندنی یاسای خێزانداری.. چونکە خێزانداری هەستێکی سروشتی و یاسایەکی بایۆلۆجی و کۆمەڵایەتییەو بناغەی کۆمەڵ و پەردەی نێوان کۆمەڵایەتی مرۆڤانەو ژیانی ئاژەڵییە.. ئەو ئافرەتەی دوور لە خێزانەو هەر ڕۆژەی لای پیاوێك و هەر شەوەی لە باخەڵی پیاوێکدا ڕۆژ ئەکاتەوە جگە لەوەی کە زۆر زوو لە تەمەنێکی لاویدا لە سك و زا ئەکەوێت و جگە لەوەی کە پیر بوو بێ لانەو ساواو دەربەدەر و کاتی نەخۆشی بێ پەنا۔ جگە لە خەستەخانە۔ دڵتەنگ و ڕەشبین و خاوەنی بیرو هۆشێکی پچڕ پچڕو دوور لە هەموو بەزەیی و سۆزێکی دایکێتی.. ئەو تام و مەزەی ژیانەی لە خێزانداریدا هەیە ئەو نایچێژێ.. ئەو یەکسانی و هاوبەشییەی نێوان ژن و مێرد لە خێرو خۆشی نەبونی و ناخۆش و دابەش کردنی هەردووکیان و**

سووك كردنی باری یەكتری هاودەستی كارو كردار چ پلەیەكی بەرزی كامەرانی و بەختیاری ئەیگاتێ..؟

٢. هەر بە شایەتی فرۆید خۆی و لە چیرۆكە ئەفسانەیەكەیدا پیشانی ئەدا كە بنچینەی كۆمەڵگای ئادەمیزادان خێزان بووە.

٣. لێكۆڵینەوەكانی زانیاری (ئەنپرۆپۆلۆجی) دەریخست كە یاسای خێزانداری و ماڵداری هەر لە یەكەمین ڕواڵەتی مێژووی مرۆڤایەتیەوە هەبووەو بە كوێرای چاوی (مۆرگان) و هەر هەموو ئەوانەی دژی خێزانن. ئێمەی موسڵمان بڕوامان وایە، كە یەكەم ژن و مێردی مرۆڤایەتی (باوكە ئادەم و دایكە حەووا) بون، تەنانەت پێش هاتنە سەر زەوی و ئاوەدان كردنەوەی، ئەوان هەر ژن و مێردی شەرعی بون[١٦٨]

٤. ئەی فرۆید خۆی ڕاست ئەكات و بڕوای بە خێزان و خێزانداری نیە.. بۆچی ژنی هێناو خۆی كردە خاوەنی حەوت سەر خێزان[١٦٩]

٥. ئەو لاوە سەرگەردانە بێ خێزانەو ئەو كچە پەتیارە بێ خاوەنەی كە خۆیان ڕزگار كردووە (بە خەیاڵی خۆیان) لە كۆتی خێزان و كۆتی ڕەوشت و ئایین و هەریەكەیان بووەتە خاوەنی

---

[١٦٨] - الاسلام و قضايا علم النفس الحديث، ص٦٢.

[١٦٩] - نظرية فرويد، دراسة وتحليل، ل٣٠-٣١.

جزدانی خۆی کە زۆر لایان وایە زۆر بەختیارن، وانیە، چونکە ئەوانە وەکو گورگی برسی و هاریان لێ هاتووەو بەهیچ شتێك تێر ناخۆن و هیچ لاوێك و هیچ کچێك و هیچ هێزێك نیە بتوانێ کەف و کوڵیـان دامرکێنێ.. خێـزان، ژن هێنـان و شـووکردن ماڵـە قوڵەیەکی یەك گیان و یەك لەش، تاقانە چارەسەرە بۆ پشووی ئەو دڵەشێتانەو ئارامی ئەو دەروونە شێواوانە.. چونکە مرۆڤ ـ ژن و پیاو ـ دەست ئەگرێت بە هەر شتێکەوە کە هی خۆی بێ و بەفیڕۆی نادات.. کاتێ کە ژن و مێرد ـ پاش تێربونی یەکەمجار ـ بۆیـان دەرئەکـەوێت کـە هەریەکـەیان خـاوەنی ئەویتریانـەو لـە دەستی دەرناچێ و تەنیا بۆ ئەوە کەی و لەکوێ بیەوێ.. ئیتر لە هەڵپە ئەکەوێ دڵنیایی و پشوو وەدەست دێنێ.

٦. بنچینەو بناغەی دارشتنی خێزان تـەنیا مەسـەلە جنسـی (یەکەی فرۆید) نیە.. بەڵکو پیاو ئاتاجی ئافرەتە و ئافرەتیش هەروەها.. نە پیاو بێ ئافرەت و نە ئافرەت بێ پیاو ئەیکرێت.. بەڵام نەك تەنیا ئاتاجی چەند چرکەیەکی جنسی و بەس، خوا ئەفـــەرموێ: { وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ } الروم ٢١

لە نیشانەو بەڵگەکانی گەورەیی و دەسەڵاتی خوایە کە هەر لە گرۆی خۆتان (ئادەمیزاد) ئافرەتی بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی

جێگای ئارام گرتن و پشووی دڵ و دەرونتان بێ و لەنێوان هەردوولاتان (ژن و مێرد) دا خۆشەویستی و بەزەیی دروست کردووە، کە ئەمەیش بەڵگەو نیشانەیەکی بەرز و دیارییە بۆ ئەو نەتەوە و کەسانەی کە بەڕاستی بیر لە شت ئەکەنەوەو لە شت ئەکۆڵنەوە.. کەواتە تەنیا تێر بونی برسێتی جنسی سەروبەری خێزان نیە.. فەیلەسووفی ئەمریکی . وڵ دیۆرانت . ئەڵێ:

( لەبەرئەوەی لە کۆمەڵگای تازەدا ژن و مێرد، ژنهێنان و شووکردنیان لەسەر بنچینەی ڕاستەقینەی خێزانی نیەو تەنیا پەیوەندی جنسی ڕووتە.. هەر لە یەکەم ڕۆژەوە خۆشەویستیەکەیان ئەمرێت و هەریەکەیان (ژن و مێرد) ئەچنەوە قابڵۆخی خۆیان و لە یەکتری جیا ئەبنەوە ).

٧. ئەوەتە پەتیارەکی وەکو (د.نوال سعداوی) لە کتێبی (الأنثى هي الأصل) ل١٦١دا ئەڵێ (ئەو ئافرەتانەی کە ژنە دەوڵەمەندن و خۆیان لە ئەرکی ماڵ و خێزان ئەشارنەوەو کارەکەر و خەڵکی ترو کارو فرمانی ماڵیان بۆ بەڕێوە ئەبەن کتوپڕی ئەو ئافرەتە ئەبێتە ئافرەتێکی بێ کەڵك و، پەستی و بەتاڵی ناو هەناوی ئەخواتەوە، جا بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییە لە ڕۆژانی ژیانیدا پڕ بکاتەوە پەنا ئەباتە بەر کۆگامان و گەڕان بەدووی مۆدێلی تازەو یان کاتی خۆی بە پیاسەی سەر شەقامەکان و ڕۆیشتن بۆ

ئاهـەنگ و خواردنـەوە و سـەماو دواجـار بـەرەڵڵایی جنسـی و بێئـابڕۆیی و بەدڕەوشتی.. لەگـەڵ ئەمانەیشـدا هـەر هەسـت بـە پەستی و دڵتەنگی و پەژارەیی ئەکات چونکە تەمەنی بە خۆڕایی بەفیڕۆ ئەڕوات و ژیانی لێ ون بووە.. پەلامار ئەباتە بەر پزیشکی دەروونی..).

٨. ژن و مێرد دەستی ڕاست و چەپی یـەك لاشـەن و هەریەکـەیان یارمەتیـدەری ئـەویتریانن و تەنانـەت کـاری جنسـی نێـوان ژن و مێـرد لەڕوانگـەی ئیسـلامەوە کـارێکی پـیرۆزەو بەخواپەرسـتی دائـەنرێت . وەکـو لـە پێشـەوە باسـمـان کرد ـ وە بـە کـارێکی ڕەوشـتی دائـەنرێت و بـاس کردنـی لـەنێوان کـۆڕو کۆمەڵـدا و درکانـدی ڕازێکـی خێزانـەو خیانەتـە بـە مـافێکی خێزانـداری، پێغەمبـەری سەروەرمان ﷺ ئەفەرموێ: (شر الناس منزلة عند الله يوم القيامة الرجل يفضي الى المراة وتفضي اليه ثم ينشر سرها/ مسلم و أبو داود) واتە خراپترین جێگاو پلەی لای خوا لە ڕۆژی پاداشـتدا بـۆ ئـەو پیـاوە کاتـێ کـە لەگـەڵ خێزانەکـەی ڕابـوێرێ و ژنەکەیشـی لەگـەڵ ئـەو ڕائـەبوێرێ، چـۆنێتی ئـەو ڕابواردنە لای خەڵکی باس بکات و نهێنی خێزانەکەی بدرێکێنێ و بڵاوی بکاتەوە.

٩. بەهەشت گیان ئەگەر سەرێك لە دادگای شەرعی پارێزگاکان بدەیت سەرت سڕ ئەمێنێ لەم هەموو کێشەی ژن و ژنخوازی و تەلاقدان و شکات کردنەوە.. بەلام وا ژن و مێردی لای ئێمە نە بە شێوەیەکی موسڵمانانە یەك ئەکەون نە خۆیان یەکتری هەڵئەبژێرن (گەورە بە بچوك و ژن و لەخوێنادراو وپشکی براو باوك).. ئەی بۆ لە ئەمەریکا، ڕۆگەی لاوان هێمای پێشکەوتنی سەدەی بیست بۆچی..؟

ئەزانی ڕێژەی تەلاقدان و بگرەو بەردەی خێزانی لە ئەمەریکا زیاترە لە هەموو سەراسەری جیهان . بەڵێ هەموو جیهان ـ چونکە ڕێژەی تەلاقدان لە هەندێ سالان لەچاو مارەبڕین لە هەندێ ناوچەدا گەیشتۆتە ٤٠٪..[١٧٠]

خۆ ئەگەر کێشەی خێزانی و تەلاقدان لە ولاتی ئێمەدا نیشانەی دواکەوتوویی تێنەگەیشتن یان یەکتر نەناسینی ژن و مێردە پێش هێنان، خۆ لەوێ پێکەوە پێش گواستنەوە دەیان شەو ڕۆژ ئەکەنەوەو کون قوژبنی ژیانی یەکتری ئەناسن و ئەزانن.. ئەی بۆ تەلاق..؟

**بەهەشت:** بەڕاستی کچە سەرلێشێواوەکانی لای ئێمەیش بەو خەیاڵەوە بیر ئەکەنەوە کە ئەگەر هەر ڕۆژێ ببنە شەمامەی

[١٧٠]– الأنسان بين المادية والاسلام، ص٢٣٧.

دەستی هەتیویێك شەوی لەگەڵدا ڕۆژ بکاتەوەو هەڵیگلۆفێ (ئیتر ئەگەر لە هەزاردا یەکێك) ڕاستی کردو هێنای جیهانێکی ئایدیالی و دوور لە ئاشووبەو جەنگ و تەلاق بەسەر ئەبات..؟

نەوڕەسی: نەخێر خوشکێ گیان.. دەنکە کولەکەو ڕۆژ بردنە سەرو پێ ڕابواردن و دەست پێگەرم کردنەوە جیاوازەو هاوەڵ و دەروونــی و هاوگیــانی جیــاوازە.. هــەر هــاوجووتی و ژن و مێردییەك لەسەر بنچینەی جنسی ڕووت داڕێژرا بە تێر خواردن و یەکتری لێسانەوە کۆتایی دێ پەیوەندی و خۆشەویستیەکە ئەمرێت یان پەژمووردە ئەبێت و دارژەقنەمووتی تەلاقدان و بگرەو بەردە چەکەرە ئەکات و سەر دەردێنێ و ڕەگ دائەکوتێ.

بەهەشت: ئەی منالی کلۆلی ئەم ژن و مێردە ئەبێ چۆن منالێك بن و لە چ خەوێکدا تامی کامەرانی بچێژن..؟

نەوڕەسی: منالّ.. بزەی ژیانی خێزان و جەمسەری پەیوەندی ڕاستەقینەی ژن و مێرد.. بەهەشت گیان ژن و مێردی . وەکو وتمان. نابێ تەنیا پەیوەندی جنسی بێ. وە دیسان نابێ تەنیا پەیوەندی سۆز و دڵدارییەکی ئایدیالی (ئیفلاتونی) بێ.. بەڵام ئەبێ بزانرێ کە جنس بەشێکە لە خۆشەویستی و سۆز نەك سەروبەری خۆشەویستی هەر جنسەو بەس، بە جنس هەموو شتێك کۆتایی دێــت.. ئــەو کاتــە خۆشەویســتی ئەبێتــە

پەیوەندییەکی ئاژەڵی.. بەڵام لە ڕاستیدا خۆشەویستی زۆر فراوانترە لە جنس و لە سەری هەموو خۆشەویستیەکانەوە خۆشەویستی نێوان دایك و باوکە بۆ منداڵەکانیان.. بەڵێ دایکێتی جنس نیە و گەلێ بەرزترە لە جنس و پەیوەندی جنسی (تاقیکردنەوەی ئەزمونگەیی دەری خستووە کە هێزی دایکێتی لە پێش هێزی تینوێتی و خواردن و جنسەوەیە واتە جنس لە پلەی چوارەمدایە)[171].

جا لانەو جێگای پەیدا بون و چەکەرەکردن و گەشەکردنی ئەو خۆشەویستەی ژیان (منداڵ و دایکێتی) خێزانە، ئەمە لەلایەکەوە لە لایەکی ترەوە کۆرپەی هیچ گیانداریك ئەوەندەی کۆرپەی ئادەمیزاد پێویستی بە لەنەیی نیە لەبەرئەوە بێ خێزان نایکرێ.

بەهەشت: کاکە گیان ئەڵین یانەکانی (کۆشگری، دایەنکاری = دور الحضانة) جێگای بەخێوکردنی باوك و دایك و نازی باوك و دایکیان گرتۆتەوە.

نەورەسی: وا نیە بەهەشت چونکە:

١. لێکۆڵینەوەکانی زانیاری دەروونناسی ئەم مەسەلەیان خستووەتەوە بە درۆوەو چەسپاندیان کە ئەو منداڵەی زیاتر لە

---

[171] – أصول علم النفس وتطبيقاته، ص٢٢٧.

کۆشێك و باوەشێك بناسێت کەسایەتی تێك ئەچێ و هەستی خۆشەویستی و یارمەتیدان لە دەرونیدا گەشە ناکات[١٧٢].

٢. هەرچی فرۆید وتوویەتی لەبارەی سووك کردنی دەوری خێزان لە ڕۆڵی بەخێوکردنی منداڵدا وا دەرنەچوو، خوا لەبن لووتی فرۆید و پارچەیەك لە خۆی بۆ نارد کە بیخاتەوە بە درۆزە ئەویش کچەکەی خۆی بوو.. (ئەننافرۆید)ی کچی لە کتێبی (أطفال بلا أسر)دا باوکی ئەخاتەوە بە درۆوەو ئەیچەسپێنێ کە ئەو منداڵەی لەناو خێزاندا بەخێو نەکرێت کەلێنێکی دەروونی گەورەی وای تێ ئەکەوێت کە نە هیچ زانایەکی دەروونی و نە کەس بۆی پڕ ناکرێتەوە[١٧٣].

بەهەشت گیان منداڵ لە سەرەتای ژیانی و تا چەند ساڵانێکی تەمەنێکی باوك و دایك بە موڵکی خۆی ئەزانێ و خۆی بە خاوەنی بێ چەن و چوونی ئەو باوك و دایکە ئەزانێ.. ئەی نابینی کاتێ منداڵێکی تر لەدایك ئەبێ ئەم ڕقی لێئەبێتەوەو ئەگەر دەستی بڕوا ملی هەڵئەکێشێ..؟

---

[١٧٢] – نظرية فوريد، دراسة وتحليل، ص٣٠.

[١٧٣] – کتێبی (اطفال بلا أسر، أنا فرويد) لە کتێبی (الانسان بين المادية والاسلام) ل٢٤٨.

٢. کاتی خۆی ڕوسیای کۆمۆنیس هەوڵی هەڵوەشاندنەوەی خێزان و هاندانی یانەی دایەنکاری کردو ئەیوت:

هەستی مڵکێتی (الملكيه الخاصه) لە خێزان و خێزانداری گەشە ئەکات لە منداڵدا لەبەرئەوە ئەبێ هانی گەشەکردنی خێزان نەدەین.. بۆیە ماوەیەکی زۆر لە ڕوسیادا منداڵ منداڵی دەوڵەت بوو کە ئەویش دوو زیانی زۆر گەورەی دا لە کۆمەڵگەی ڕوسی هەتا لەم ساڵانەی دواییدا وەکو زۆر لە بڕیارە سۆشیالیستیەکانی تر لێی پاشگەز بونەوەو دەستیان دایە هاندانی خێزانداریی.

بەهەشت: ئەی زیانەکان چی بون..؟

نەورەسی: ئەو منداڵانەی کە ئەبونە منداڵی دەوڵەت و ئەو پەروەردەی ئەکردن، هەرچەند لەڕووی پۆشتەو پەرداخی و خواردن و تەندروستی فەسیۆلۆجییەوە تەواو بون.. بەڵام لەڕووی سایکۆلۆجییەوە زۆر ناتەواو بون.. منداڵێك دڵ ڕەقی بێ کەڵك بۆ هیچ کەس.. دڵ و دەروونی هەستی مرۆڤایەتی تێدا نەبوو وەکو ئامێرێکی ئاسنین ئەرکەکانی سەرشانی ڕۆژانەی خۆی بەجێئەهێناو هیچی تر.. ئەمە لەلایەکەوە لە لایەکی ترەوە هیچ ژن و مێردێك هیچ پەیوەندییەکی خۆشەویستی و سۆزیان بۆ یەکتری نەما..

چونکە منداڵ بۆ میریەو هەر یەکەیان خاوەنی پارەو کاسبی و موچەی خۆیەتی و ئاییینیش نیە پەلی هەر ژنە بداتە دەستی پیاو، بە پێچەوانەوە ئەوان لایان وایە ئافرەت سەربەخۆیی تەواو وەرئەگرێ کە ژنی یەك پیاو نەبێ و بەڵکو ماڵی گشتی بێ ئیتر سۆزی چی و خۆشەویستی چی..؟ کە مەسەلەکە مەسەلەیەکی تێربونی جنسی بێ چ جیاوازی نێوان ئەم پیاوەو ئەو پیاوەی تر هەیە..؟ خۆ ئەوان وەکو ئێمە کۆنەپەرست و خاوەن ڕەوشت نین تا مەسەلەی نیکاح و خۆشەویستی ژن و مێرد و دڵسووتان بۆ یەکتری لە گۆڕدا هەبێ.

٤. ئەلەکسیس کاریك هەڵگری خەڵاتی نۆبڵ ئەڵێ:

( کۆمەڵگەی تازە هەڵەیەکی گەورەی کرد کە منداڵی لە دایك و باوکی دابڕی بۆ ئەوەی ئەوان بنێرێ بۆ کارگەو کارکردن و منداڵەکانی نارد بۆ (یانەی دایەنکاری) ئەو تووتەڵە سەگانەی لەگەڵ یەکتری ئەژین لە یەك تەمەندا هەرگیز گەشە ناکەن وەکو ئەو توتەڵەی لەگەڵ دێڵ و گەماڵەکەی دایك و باوکیدا ئەژی.. چونکە منداڵ لەسەر ئەو کەسانەی دەوروبەری خۆیەتی و کەسایەتی دائەڕێژێ کەواتە بۆ ئەوەی منداڵ چاکتر پێبگات و

زووتر گەشە بکات و کەلێنی دەروونی تێنەکەوێت پێویستە لە خێزاندا بژی و هاوڕێی باوك و دایکی بێ..)[174].

٥. تەنیا دابین کردنی بژێوی پۆشاك و خۆراك نابێتە سەروبەری ژیانی منداڵ، منداڵ پێویستی بە بۆنی سنگی دایك و بەزەیی باوکانەی باوك هەیە.. هەروەکو ئەوانیش ژیانیان ئەنەخشێنن بە بزەی سەرلێوی منداڵ و گغەو ئەنگای ساوایەك.

٦. ئێمە ناڵێین با یانەی دایەنکاری لە وڵاتدا نەمێنێ بەڵکو ئەوبێ بڵێین منداڵ ناردنە یانەی دایەنکاری (دار الحضانة) ناچارییەو چارەی تر نییە.. ئیتر نابێ سنگی بدەین بەسەر خێزان و ژیانی منداڵ لە خێزاندا.

٧. هەرچەند (موچەخۆری شتێکی تازەیە لەناو ئافرەتی کوردا، لەبەرئەوە زۆر حەزی لێ ئەکەن، بەڵام نابێ لەسەر حسابی کۆرپە شیرینەکانیان بێ.. بەخێوکردنی منداڵ ـ دەبێ بزانین ـ بەرزترین و نایابترین پیشەیە، بواردن (واتە اهمال)ی منداڵ لەبەر هەرچی بۆنەێك بێ، تاوانێکی گەورەیە. ئەو منداڵە کە گەورە بوو ڕقن، ترسنۆك، تووڕە نەخۆش یان لەکارو کردەوەی تەوەزەل و کەم تەرخەم دەبێ..)[175].

---

[174] - الأنسان ذلك المجهول، ص٢١٨-٢١٩.

[175] - کچانی کورد، پێشەکییەکەی د.ناجی عباس، ل٢.

بەهەشت: کاکە گیان تۆ ڕات چۆنە بەرابەر بەو وتەی فرۆیدە کە ئەڵێ ( کەسایەتی مرۆڤ لە پێنج ساڵەی تەمەنی منالییەوە دروست ئەبێ و لەدوای تەمەنی پێنج ساڵە هەرهەوڵێکی چاککردن و چارەسەرکردنی لەگەڵ بدرێ بەفیڕۆ دەرئەچێ..)[176]؟!.

نەوڕەسی: فرۆید بە یەك خەنجەر پشتی باوکان و قەپرغەی منالەکانی کون کردووە.

بەهەشت: بۆچی..؟

نەوڕەسی: چونکە ئەو ماوەیە کە فرۆید باوکان ئاگادار ئەکات بۆ پەروەردەو گوێڕایەڵی.. ماوەیەکە باوکان بە گەمە و گاڵتەو پێکەنین لەگەڵ منال بەسەری ئەبەن.. قۆناغی ئامۆژگاری و چەماندنەوە لە دوای تەمەنی شەش ساڵییەوە دەست پێئەکات.. جا ئەو کاتە ئەگەر باوك وتی بە کوڕەکەی، ڕۆڵە گیان وا بکە.. فرۆید پێتی ئەڵێ.. نەکەی، نا، تازە کاتی ئامۆژگاری تەواو بوو.. کەسایەتی خۆی تەواو کردووەو ئامۆژگاری و پەروەردە کردن نرخی نیە.. بۆ ئەوەی لەلایەکی ترەوە هەر خۆی بە گەنجەکان بڵێ: ئایین ئەفسانەیەو ڕەوشت درۆیەو.. هتد، بەهەشت گیان

---

[176] - کتێبی (نحو علم نفس اسلامي) د.حسن الشرقاوی لە کتێبی (کتاب الله یاولدی) ل٣٦.

ئایا هاتنی پێغەمبەران و پیاوچاکان و، مامۆستایانی کۆمەڵایەتی بۆ منالانی تەمەن (٣ـ ٥) ساڵین، یان بۆ لاو و گەورەن..؟! ئایا محمدی پێشەوا ﷺ نەیتوانی ئەو مرۆڤە کەللە ڕەقە بتپەرستە عارەق خۆرە داوێن پیسانەو خۆپەرستە عەرەبانە بگۆڕێ و بیانکاتە پێشەوای مرۆڤایەتی و بیانکاتە فریشتەو لە شێوەی مرۆڤدا..؟ ئایا هەر لە ڕۆژانی ژیانماندا دەیان خراپمان نەدیوە باش بووەو دەیان باش خراپ بووە..؟.. نەخێر بەهەشت گیان ئەو وتەی فرۆید چاوڕاو ژارێکی کوشندەیە، نەك تیۆرێك یان وتەیەکی زانیاریانە.

بەهەشت گیان فرۆیدو هاوبیرانی وەکو فرۆید ئەوروپایان لەڕێڕەوی مرۆڤایەتی دەرکردو کاڵ و خێزانی هیچ تام چێژێك و کامەرانی خێزانداریی تێدا نەماوە، وا لە خوارەوە نموونەی چارەڕەشی و ناسۆری ئەوروپاییەکی بێخێزانت بۆ باس ئەکەم.. ئەو ئەوروپایەی کە ئێمە ( یان ڕاستتر بڵێم سەر لێشێواوەکانی لای ئێمە ) لەگەڵ ناوهێنانی لیبیك بە دەمیانەوە دێتە خوارەوە.

گۆڤاری (الف باء) لە ژمارە (٧٣٠) ڕۆژی ١٩٨٢/٩/٢٢ لەژێر ناونیشانی (بۆس ئەوروپا) بەسەرهاتی ئەوروپاییەکی بێ خێزانی نوسیوەو نووسەر لە سەرەتای باسەکەدا ئەڵێ ( ئەوانەی کە وێنەی ژیانی ئەوروپامان بۆ دەکێشن و پیشانمان ئەدەن، گوایا

ژیان لە ئەورووپا وەکو لەبەهەشتێکدا بژیت وایە.. ئەو شارستانێتی و پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنیك و دیموکراتی.. بەڵام وا بۆن و بەرامە گەنیوەکەی ئەورووپا خەریکە بەرز ئەبێتەوەو لوت تووشی هەڵامەت ئەکات، چ لەبارەی کێشەو ئاپۆرەچوونی ڕامیاری و چ تێکچوونی بارودۆخی ئابووریان و چ لەکاتی سەرنجدان و وردکردنەوەی ژیانی خەڵکی ئەورووپاوە)[١٧٧] وە کابرای نوسەر (صالح الدبوس) لە ل٤٨ـ ٤٩ی گۆڤارەکەدا ئەڵێ ( لە یەکێ لە ڕۆژەکانی مانگی مایسی ساڵی ١٩٧٥ دا خانەنشین (متقاعد)ی ئەڵەمانی (کیرهارد کۆرنج) کە تەمەنی (٦٨) ساڵ بوو ئەڕواتە ژوورەکەی خۆیەوە.. کە ئەڕواتە ژوورەوە دەرگاکە لەسەر خۆی دائەخات وەکو هەموو ئەوانەی لە ئەورووپا لەترسی دزو تاوانکاران دەرگا لەسەر خۆیان دائەخەن.. وا دیارە ئەو پیاوەی دوای ئەوەی چەند شوشەیەك بیرەی هەڵقوڕاندووە بێ هۆش ئەکەوێت، چونکە دوایی شوشەکان بەبۆشی لەسەر مێزە بچووکەکەی مابوویەوە.. هەرچەند ئەم بەسەرهاتەی ئێمە ئەیگێڕینەوە بۆ. وەکو لە پێشەوە باسمان کرد. سەرەتای مانگی مایسی/ ١٩٧٥ بەڵام هەتا ڕۆژی سێی مانگی حوزەیرانی

[١٧٧]- ل٣ی گۆڤارەکە.

ئەمساڵ (١٩٨٢) کەس دەرگای ئەو ژوورەی نەکردۆتەوە ئەم ماوە دوورو درێژە ئەم پیاوە لەم ژوورەدا ماوەتەوە!!

پاش ماوەی حەوت ساڵ جا (کیرهارد)یان بیرکەوتەوەو وتیان ئەوە لە کوێیە، هاتن بۆ ئەوەی دەرگای ژوورەکەی بشکێنن و هەواڵێك بزانن..کە کردیانەوە، سەیریان کرد، بوەتە لاشەیەکی بێ گیان و ئەتوت تەرمێکەو مۆمیایی کراوە، ئەمە چۆن بووە..؟ (کیرهارد) ماوەی حەوت ساڵ لەسەر چەرپاکەی بە مردوویی مابوویەوەو نە هاوڕێیەکی نە هاوسەرێکی نە دراوسێیەکی نە خزم و خۆیش و ئاشنایەکی هاتن هەواڵێکی بپرسن یان سۆراغێکی بکەن.. تا ئەو کۆمپانیایەی ئەو کۆمەڵە خانوو هۆدانەی بەکرێ گرتبوو لە شەقامی (لۆدڵ) لە شاری (میۆنیخ) ئاگاداری پۆلیسی کردو هاتن بۆ شکاندنی ژوورەکە.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم موچە خۆرێکی میری و خانەنشین کراوە لە دەیان سەرەوە پەیوەندی بە میری وڵاتەکەیەوە هەیە ئەویش لێی نەپرسیوە.. هەتا کاتێ ژوورەکە شکاو شوشەیەکی شیری کابرایان دەست کەوت لێی نوسرا بوو مانگی مایس ١٩٧٥ پڕ کراوە.. پاش لێکۆڵینەوەی تەرمەکە پزیشکی دادگا وتبووی لە ئەنجامی ئەو بێهۆشیەی بەسەری هاتووەو جگەرەی بە دەستەوە بووە جگەرەکە لە دەستی کەوتۆتە خوارەوە سەر نوێنەکانی

کاتێ دووکەڵ پەیدا بووەو دەرگاو پەنجەرەی ژوورەکەیش زۆر چەسپ بووە، خنکاندوویەتی، ئەم هەژارە ئەو ماوە دوورو درێژە لەو خانووەدا لەگەڵ سی (٣٠) زەلامی ترو هەر یەکەیان لە ژووری خۆیان ژیاون کە هەموویان و هەر سی ژوورەکە ئەکەوێتە سەر ڕێڕەوێکی درێژو تووڵاتی و هەموویان لەیەك دەرگای گەورەوە ئەهاتنە ناوی وە هەر بە سێ ژوور گەرماوێکی هاوبەشیان هەبوو، لەگەڵ ئەمانەدا کەچی هیچ کامیان هەواڵی نەپرسیووە.. ئایا تۆ بڵێی بۆگەنی ئەم لاشەیان نەبیستبێ یان لەبەر بەنگ کێشان و سەرخۆشی خۆیان بۆن ناکەن!!؟

ئەم پرسیارە مامۆستایەکی زانیاری کۆمەڵایەتی لە زانکۆی (میونیخ) (کە باسی ئەم بەسەرهاتەی بۆ قوتابیەکانی ئەکرد) ئەم پرسیارەی لێ کردن و وتی ئەمە نەك تەنیا ئەم زەلامە بەو شێوەیەو ئەم ماوە دوورو درێژە مردووەو کەس هەستی پێ نەکردووە بەهەزاران کەس بەم شێوەیە ئەمرن کەس پێیان نازانێ. لەبەرئەوەی کۆمەڵایەتی لەنێوان ئەندامەکانی کۆمەڵگای ئێمەدا . ئەوروپا. نەماوەو هەستی مرۆڤایەتیمان تێدا نەماوە..).

بەهەشت: کاکە گیان ئەی چۆن خاوەن خانوو نە ئەهاتە سەری بۆ کرێ خانوو، یان پارەی ئاو و کارەبای چۆن بۆ ئەدرا..؟

نەورەسی: خوشکێ گیان (کیرهارد) وەکو لەپێشەوە وتمان موچە خۆرێکی خانەنشین بوو ئەو مووچەیە یەکسەر لە دائرەی خانەنشینانەوە بۆی ئەنێررا بۆ بانق و لەسەر حیسابی ئەم بۆی ئەنوسرا، بانقیش لە حیسابی ئەم کرێی خانووەکەی بۆ ئەنارد بۆ کۆمپانیای خاوەن خانووەکە.. کابرای کارەبایش هەموو سەری مانگێ کە ئەڕۆیشت سەیری خەرج کردنی کارەبای ئەکرد لەبەرئەوەی هیچ گڵۆپێکی دانەگیرساند بوو کارەبای سەرف نەئەکرد تەنیا ڕادیۆکەی کاری ئەکردو یەك گڵۆپی سفر، ئەمانیش نرخی کارەبا سەرف کردنیان لە پێنج (مارك) کەمترەو داوای لێ ناکرێت.. تەنانەت پۆستەچی هەر تاوە ناتاوێك سنووقی پۆستەکەی (کیرهارد)ی پڕ ئەکرد لەنامەو پاش ماوەیەك ئەیگەڕانەوەو لەسەر زەرفەکانی ئەنووسی (ناوبراو دیار نیە).

بەهەشت گیان نووسەری بەسەرهاتەکە لە گۆڤاری (الف باء)ی ناوبراوادا ئەڵێ (ئەمە تاقانە ڕووداو نیە لە ئەوروپا پیاوێکی تر لە ساڵانی شەڕی جیهانی دووەمدا ناوی لە لیستەی ونبووەکانی جەنگدا نوسرا بوو کە گوایا ون بووە بەڵام لە ساڵانی دوایی جەنگدا (١٩٤٥) پەیدا بوو، ژن و کچ و خوشکەکەی دۆزییەوە کەچی هیچیان داڵدەیان نەداو هەتا لە پەنایەکدا ئەویش مردوو

بۆگەنی کردو بە بۆگەنەکەیدا خەڵکی دۆزیانەوەو دایان بە شارەوانی بۆ ناشتن.. هەر لە ساڵی ١٩٧٧ دا پۆلیسی ئەڵمانی پیاوێکی تریان دۆزیەوە کە پێش دوو ساڵ لەمەو بەر لە شاری (گلادبیك) مردبوو وە هەر لە هەمان ساڵدا لە (بەرلین) پیاوێکی تر پێش دە مانگ مردبوو کەس پێی نەزانیبوو.. وە لە شاری (هامبۆرگ) تەرمێکیان دۆزییەوە کە چوار ساڵ بوو مردبوو ئەویش کەس پێی نەزانیبوو.. ئەمەیە وڵاتی شارستانی و پێشکەوتن و تەکنەلۆجی خەڵکی ئەمرێ بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ.. بەڵام توخوا ئەگەر مەکینەیەك بشکایەو لەکار بکەوتایە هەموو بۆی نەئەخرۆشان..؟!).

وایە بەهەشت گیان لای ئەوان سەگێك یان باڵندەیەکی ماڵی یان مەکینەیەك گەلێ نرخ و ڕێزی زیاترە لە مرۆڤ.. ئەگەر پەیوەندی خێزان و پەیوەندی باوك و دایك و کەس و کار بە یەکەوە بمایە چۆن تەرمێك حەوت ساڵ بێ خاوەن ئەمێنێ!!.

جا ئەمە ئەنجامی چەسپاندنی وتەکانی فرۆیدە لە ئەوروپاداو سووککردنی پەیوەندی خێزانداری و پەیوەندی کۆمەڵایەتی.

## ویژدان لەڕوانگەی فرۆیدییەوە :

بەهەشت: کاکە گیان ئەوروپا بەهۆی بێ بڕواییان بە پاداشتی پاشەڕۆژو هەڵاتن (بەهۆی کەنیسەوە) لە وشەی خواو لەڕێی خواو ئەو جۆرە شتانە، تووشی ئەو ژیانە ئاڵۆزو بون بۆیە بۆ پڕکردنەوەی ئەو نیوەی ژیانە . نەك کەلێن . هەڵسان بە تاشین و داڕشتنی هەندێ وشەی وەکو مرۆڤایەتی و ویژدان و ئەم بەندو باوە.. ئەی فرۆید لەبارەی (ویژدان)ەوە هیچ ناڵێ، وەکو زانایەکی سایکۆلۆجی ئەبێ شتێك هەر بڵێ..!؟؟

نەوڕەسی: ڕاستە بەهەشت گیان کاتێ کە باوەڕ بەخوا نەماو خەڵکی چاوەڕێی پاداشتی خواییان نەکرد، ئەو کاتە هەر پەنجە پینەیەك بکرێ شتێکی ڕووکەش ئەبێ.. فرۆید زۆری لەسەر ویژدان وتووە، بەڵام گوشراوی هەموو وتەکانی:

١. لای فرۆید، ویژدان شتێکی سروشتی و ڕیشەدار نیە لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵکو بیرکردنەوەیەکی سەرزارییە لەو شتانەی کۆمەڵگا لەسەر تاك قەدەغەی کردووە.

٢. لای فرۆید، ویژدان بریتی یە لە دژەکردارو کاردانەوەیە دژی ئەو سنوورو یاساو بەندوباوەی کۆمەڵ لەسەرمان دایناوە[١٧٨].

---

[١٧٨]- الطفل بين الوراثة والتربية، ج١، ص٢٣٠

٣. لای فرۆید، لە کاتێکدا مرۆڤ داخوازییە سروشتیەکانی خەفە ئەکات و ڕووی ناوەوەی خۆی ئەشارێتەوە بۆ ئەوەی کە هەڵنەشاخێت بە هێزەکانی دەوروبەریدا ئەو هێزەو هەستە پەیدا ئەبێ کە پێی ئەڵێن ویژدان.

٤. کاری ویژدان کپکردنەوەی هەست و سۆزی دەروونییە بۆ ئەوەی لە دەستی کۆمەڵ و یاساو ڕژێم و ئاین ڕزگاری بێ[١٧٩].

٥. فرۆید گاڵتەی دێ بە ویژدان و ئەڵێت: ویژدان گاڵتەکردنی خەڵکیە بە خۆیان[١٨٠].

بەهەشت: کاکە گیان، بەڕاستی ئەمانە ئەیانەوێ ئەوی تروسکایی مرۆڤایەتی و خووی مرۆڤایەتییە لەم مرۆڤە هەژارانە بیسڕنەوەو وەکو ئاژەڵێکی ڕووت (بێ هیچ پەیوەندییەك بیانبەستێت بە یەکەوە) بەڕەڵڵای بکەن.

بەڵام بەهەر حاڵ تۆ لە بەرابەر ویژدان یان ڕاستتر بڵێین: ئیسلام هەڵوێستی بەرابەر بە ویژدان چۆنە..؟

نەورەسی: پێش ئەوەی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە سەیری ئەو هەستە ناسکەو ئەو سۆزە دەروونیەی ناوتوێ توێی قوڵایی مرۆڤ

---

[١٧٩] – الانسان بين المادية والاسلام، ص٣٣.

[١٨٠] – نظرية فرويد، دراسة وتحليل، ص١٦.

(ویژدان) بکەین پێویستە هەڵەکانی مامۆستا فرۆید ڕاست بکەینەوە پێی بڵێین:

١. ویژدان و هەستی ویژدانی هەستێکی خواییەو لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا خوا پێی بەخشیوە نە هەڵاتنە لەتۆڵەی کۆمەڵ و نە کلکە لەقەیە بۆ یاساو ڕژێم.

بەهەشت گیان، هەموومان ئەزانین منداڵ لە جیهانێکی پاکی بێ ڕتووش و دیکۆردا ئەژی، هەموو هەڵسوکەوتی سروشتییەکی ڕووتە، نە یاساو نە بەندوباوی کۆمەڵ و نە ئامۆژگاری ئایین ئەزانێ.

با بڵێیت لە دوورەوە خۆمان لە کۆمەڵێك لەو ساواپاکانە، داگرین و بڵێین یەکێ لەو منداڵانە سێوێکی هەیەو ویستی بڕوا دەست بشواو سێوەکەی دایە دەست یەکێ لە منداڵە هاوەڵەکانی هەتا چەچەکانی ئەشوا.. بەڵام کاتێ منداڵەکە دەستی شۆری و گەڕایەوە سەیری کرد هاوڕێکەی سێوەکەی خواردووە، زۆر ڕوونە کوڕە خاوەن سێوەکە دڵگران ئەبێ و دەست ئەکاتە سەرزەنشتی هاوەڵەکەی . ئەگەر شەڕیشان نەبێ. و دڵگران ئەبێ و ئەزانێ کە مافێکی لێ زەوت کراوە.. کوڕە سێو خۆرەکەیش ڕەنگی تێك ئەچێ و هەست بە پەشیمانی و قسە پسکاندن و، هەوڵ ئەدا ڕێگەی دەستدرێژییەکەی پاك بکاتەوەو خۆی قوتار

بکات.. منالّەکانی دەورووبەریان هەموویان لایەنگری کوڕەی سێو خوراون.. باشە بەهەشت گیان چ هێزو هەستێك هەیە ماف بدا بە کوڕی سێو خوراو هەق و حیساب لەگەڵ کوڕە سێو خۆرەکە بکات و لێی سوور بێتەوە..؟ چ هەستێك هەیە پاڵ بنێ بە منالّەکانی دەورووبەریان لایەنگری ماف زەوت کراوەکە بگرن..؟

خۆ کەسیان ئایەتی: { إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا } النساء ٥٨ ، یان، نەخوێندووەو کەسیان هیچ لەیاسای مەدەنی و جنائیان نەخوێندووە.؟! ئەزانی چییە.؟

ئەوە ویژدانە.. کە ڕاستترین دادگای دەروونییەو بەرزترە لە هەموو دەسەلاّتێکی تر.

ئەم نموونەیە ئەوەمان پیشان ئەدا کە ویژدانی ڕەوشتی هەست کردن بە تاوان لەگەڵ سروشتی مرۆڤدایەو هەر لەگەڵ پەیدابونی مرۆڤدا خوا ئەو هەستەی پێ بەخشیوە.

٢. ویژدان بانگی مرۆڤایەتییە لە دەروونی مرۆڤدا بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەکانی.. یەکێکە لەو ڕێگانەی کە مرۆڤ ڕائەکێشێ بۆ لای ئایین و خواپەرستی ئەگەر خاوەنەکەی بەگوێی بکات و دوای بکەوێ.

٣. زۆرجار ویژدان تەنیا بە ئاگاداری هاوارکردن واز ناهێنێ لە خاوەنەکەی بەڵکو لۆمەی ئەکات و سزای ئەدات و ژیانی لێ تاڵ

ئەکات.. پێشەوامان عەلی کوڕی ئەبو تالب (خوای لێ ڕازی بێت) ئەفەرموێ: (كَم مِنْ شهوة ساعة أورثت حزنا طويلا)
واتە زۆرجار ڕابواردن و مەزەی کاتژمێرێك مرۆڤ ئەخاتە دڵتەنگی و پەژارەیەکی درێژە خایەن و تولانی.. ئەو دڵتەنگی و پەستییە سزای ویژدانە. زۆرجار مرۆڤ ئەتوانێ لەدەست دادگا هەڵێت و وەکو بەرزەکی بانان دەرچێ.. ئەتوانێ ئەو وڵاتە بەجێبهێڵێ و سەری خۆی هەڵگرێت و بڕوات.. بەڵام ناتوانێ لەدەست ویژدان و سزای ویژدان هەڵێت.. ویژدان دادگای بۆ دائەنێ و بێ ئەوەی داوای شایەتی و پارێزەری لێ بکات و سزای ئەدات و ژیانی لێ ئەکات بە دۆزەخ..

بەهەشت گیان، هەمورمان ئەزانین دۆڕاندنی جەنگی جیهانی دووەم لەلایەن یابانەوەو سەرکەوتنی ئەمریکا بەسەر (یابان)دا هۆی یەك تاقەلاوی ئەمریکی بوو، کە ئەویش ئەفسەرێکی هێزی ئاسمانی ئەمریکی بوو ناوی (کلۆدئیترلی) بوو.. (کلۆد) یەکەم کەس بوو لە سەراسەری مێژووی مرۆڤایەتی دا توانی لە ماوەی چەند چرکەیەکدا (١٥٠) هەزار یابانی لە ژن و منداڵ و پیر و لاو بکوژێت و یابان دەسەوسان بکات بە گەردنی کەچی لە بەرابەر هێزی ئەمریکای مرۆڤ کوژدا..

(کلۆد) هەڵبژێراوی هەموو ئەفسەرانی هێزی ئاسمانی بوو وە دڵڕەقترین ئەفسەریش بوو.. کاتێ ئەو کوشتارە زۆرەی کرد گەورەترین پیرۆزبایی لێکراو، لەلایەن دەوڵەت و گەلی ئەمریکییەوە بەرزترین خەڵاتی (وسام)ی جەنگی پێدرا.

بەپێی گەزوو تەرازووی ماددییەکان و جیهانی ماددە ئەبێ ئەو ئەفسەرە پاشەڕۆژێکی پڕ لە کامەرانی و بەختیاری رابوێرێ.. هەموو شتێکی هەیە.. کۆشك، پارە، ئۆتۆمبیل، خۆ ئافرەت لە ئەوروپا و ئەمریکا بۆ لاوێکی وا زۆر زۆرە ئیتر ئەبێ لەچی کەمی هەبێ..؟؟

کەچی لەپڕ نەخۆش کەوت و تووشی هەرەس هێنانی عەسەبی بوو.. ماوەیەك لە نەخۆشخانەی (ڤالۆ) کەوت و چەند پزیشکێکی سایکۆلۆجی سەرپەرشتیان ئەکرد.. نەخێر چاری نەکراو لەپڕ شێت بوو.. گوێزرایەوە بۆ شێتخانە لەوێش هەڵات و لە شێتخانە رای کرد.. هاربوو دەستی ئەوەشاند، ڕۆژنامەیەك نووسیبووی (ئەمڕۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەمریکا، وێنەو نیشانەکانی (کلۆدئیترلی)یان بلاوکردۆتەوەو ئاگاداری خەڵکیان کردووە کە ئەو ئەفسەرە فڕۆکەوانە بەرزەو خاوەنی ئەو (وسام)ە شێت بووەو لە نەخۆشخانەو لە دەستی پۆلیس هەڵاتووەو زانایانی دەروونناسی ئەڵێن (لەبەرئەوەی .کلۆد. خۆی زۆر بە تاوانبار

ئـەزانێ ڕەنگـە سـزایەکی نائاسـایی خـۆی بـدات و خـەڵکیش تووشی ئەشکەنجە بکات.. بۆیە بە ملیۆنەها خەڵکی ئەمریکی وێڵـن بـە شـوێنیداو ترسـیان لێ نیشـتووە..) وە (پـۆلیس داوای یارمەتی لە خەڵکی ئەمریکا ئەکات بۆ گرتنەوەی (کلۆدئیترلی) کە لە شێتخانە هەڵاتووە، زانا دەروونناسەکان ئەڵێن (کلۆد) لەبەر خۆیەوە هەر ئەڵێ (من تاوانبارن من بکوژی هەزاران بێ تاوانی یابانم).

بەهەشت گیان ئەزانی بۆچی وای لێهات..؟

بەهەشت: نەوەڵڵا، بۆچی وای لێهات..؟

نەوڕەسـی: لەبەرئەوە (کلۆد) تـوانی لـە دەسـتی گـەلی یابـانی هەڵێت و گەل و میری و سووپای ئەمریکی بە چەکی ئەتۆمییەوە پشتیوانی بێ و خۆشترین ژیانی ئەمریکایی بۆ دابین بکەن.. بـەڵام (کلـۆد نـەیتوانی لـە دەسـتی دادگـای ویـژدان و تۆڵـەی دەروونی و دەستی بەهێزی خوا ڕزگاری بێ. هەر لەم جیهانەدا، خۆ سزای گەورەی خوایی و ڕەستاخێز بەهێزترە - ویژدانی، هەرچی بیری لەو تاوانە گەورەیە ئەکردەوە بە هەزاران شێوە هێرشی بۆ ئەهێنا، هەتا وای لێهات لە وزەیدا نەماو بەیەکجاری (أعصاب)ی هەرەسی هێناو هەناوی کەوتە خوارەوەو خۆی چیتر پێ نەگیراو شێت و هار بوو.

٤. بەهەشت گیان هەست کردن بە خراپەکاری و داگیرساندنی گڵۆپی سووری مەترسی ویژدان لە کاتی منالی لەگەڵ گەورەییدا جیاوازە، منالْ بەپێی جیهانە خاوێنەکەی خۆی چاك و خراپ ئەخەملێنێ و بڕیاری (ئەمە باشەو ئەوە خراپە) ئەدا بەڵام کاتێ کە گەورە بوو لاپەڕەی مێشکی بە کردەوەو گەز و تەرازووی کۆمەڵ کێشاو نووسی، ئەو کاتە ویژدانیش پێوەرەکانی خۆی ئەگۆڕێ و کۆمەڵ و پاڵەپەستۆی کۆمەڵ تێیدا ڕەنگ ئەداتەوە.. بەڵام ماکی ئەو ویژدانە سەرەکییە هەر ئەمێنێ.. هەروەها چۆنێتی پەروەردەکردنی ئەو منالە لەو ماڵ و خێزانەدا کاریگەرە بۆ شێوەی سەرزەنشتی ویژدان بۆ نموونە، موسڵمانێك کە بە موسڵمانەتی پەروەردە کرابێ و لە خێزانێکی موسڵمانانەدا پەروەردە بوو بێ بێزی دێتەوە و ویژدانی بریندار ئەبێ کاتێ لەناو کۆمەڵێکدا بێ عارەق بخۆنەوە، ئەگەر چی خۆیشی نەیخواتەوە.. بەڵام منالێك لە ماڵێکی بەرەڵڵاو دوور لە خوا پەروەردە بوو بێ بەلایەوە شتێکی ئاساییەو، ویژدانی سزای نادات.

بەهەشت: ئەمە باسی ویژدان و پەرچ دانەوەی مام فرۆید بوو بەگشتی.. ئەی ئیسلام ڕای چۆنە بەرابەر بە ویژدان و ئایا ددانی پێدا ئەنێ یان نه ء.؟

نەوڕەسی: بەڵێ خوشکێ گیان ویژدان نموونەیەکی دادگای خواییە لە دڵی مرۆڤدا و ئیسلام بە پیرۆزی دائەنێ و قورئان پێی ئەڵێ (النفس اللوامە) واتە ئەو هێزو هەستە دەروونییەی لۆمەو سەرزەنشتی خاوەنەکەی ئەکات لەسەر کاری خراپ و بەد خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا سوێنی بە ویژدان خواردووە لەبەر ڕێزو گەورەیی و خۆشەویستی (ویژدان) لای خوا.. ئەفەرموێ:

{لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ۝٢ }سوره القيامه

واتە: سوێن بێ بە ڕۆژی ڕەستاخێز وە سوێن بێ بە دەروونی سەرزەنشتکەری خاوەنەکەی..)[181]

٢. ئیسلام زۆر گرنگی ئەدا بە ویژدان و پەروەردەی ئەکات و هەر لە منالییەوە گەشەی پێ ئەکات ڕای دێنێ لەسەر خۆشەویستی و یارمەتی و دادپەروەری ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾حجرات: ١١، و ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ المائده: ٨، و(وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًا) حجرات: ١٢، و (مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم كمثل الجسد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى) حديث شريف، ( الناس بخير ما تعاونوا) حديث شريف، (الناس سواسية كأسنان

---

[181]- هذا نبيك يا ولدي، ص٢٢.

المشـط) حـدیث شـریف. و هـەزاران شـێوەی پـەروەردەو پتـەوکردنی ڕەگ و ڕیشـەی ویـژدان لـە دڵ و دەروونـی مرۆڤـی موسـڵماندا.. بۆیـە ئـەو خەڵکـەی لێ دروسـت بـوو، بۆیـە ئـەو سەرمەشـقە بـەرزە پیرۆزانـە دروسـت بـون کـە بـون.. مـن نـاڵێم خەڵکی لەژێر سایەی ئیسلامدا ئەبن بە فریشتەو ئیتر پیاو خراپ نامێنێ و کەس ماڵ و سامانی ناوێ و گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو ئـەخۆن.. بـەڵام ئـەڵێم کاتـێ خـەڵکی لـەژێر سـایەی ئیسـلامی ڕاستەقینەدا ژیان، کۆمەڵگەیەك دروست ئەکەن پاکترو خاوێنتر هەرچی کۆمـەڵگای تـر هەیـە لـە سەراسـەری مێـژوودا.. مرۆڤـی پەروەردەی موسڵمانەتی پاکترە لە مرۆڤی پەروەردەی هەر یاساو ڕژێمێکی تر.. ئەوەیش مێژووی دەوری موسڵمانەتی ڕاستەقینە شایەتە.

٢. ویـژدانی موسڵمانان پـەروەردە ئـەکرێ بۆ یارمـەتی ڕاستـی و ڕاستی خوازی هەر لە ڕۆژانی گڕوگاڵیـەوە هـەتا ڕۆژی ماڵئاوایی لە ژیان، ویژدانی موسڵمان پەروەردەکراوو گۆشکراوی شۆڕشە.. بۆیە موسڵمان لە هەموو کەس شۆڕشگێڕترو ڕاستی دۆستترە.. وا لـە خـوارەوە نموونـەی چـۆنێتی پـەروەردە کردنـی شۆڕشگێرانەی موسڵمانت بۆ باس ئەکەم:

أ. ئیسلام ویژدانی موسڵمان پەروەردە ئەکات لەگەڵ خۆی و داخوازییەکانی لەش و ورگی خۆی شۆڕشگێڕ بێ و جڵەو بۆ خۆی شل نەکات حەرام و حەلاڵی پێکەوە تێچڕێنێ.. ئەم قۆناغە شۆڕشە (شۆڕش لەگەڵ خۆت) پێغەمبەری سەروەرمان ئەفەرمێ: (غەزاو تێکۆشانی گەورە = الجهاد الاكبر).. جارێك پێغەمبەری خۆشەویستمان لە غەزایەکی زۆر قورس و پڕ لە تینوێتی و برسێتی و ماندووبون هاتەوەو ڕووی کردە هاوەڵەکانی و فەرمووی (عدنا من الجهاد الأصغر الى الجهاد الأكبر)
واتە: وا لە غەزاو تێکۆشانی بچووك گەڕاینەوە بۆ غەزاو تێکۆشانی گەورە).. تێکۆشان لەگەڵ دەروون و داخوازییەکانی چاوبرسییەکانی[١٨٢].

ب. تێکۆشان لەگەڵ ستەمکاران و پشتگیری و لایەنگری ستەملێکراو و چەوسێنراوەکان، ویژدان بەهێز ئەکات و ڕامی ئەکات لەسەر ڕاست وتن و کردەوەی ڕاست و خۆبەخت کردن لەڕێی ڕاستی خواویستیدا پێشەوامان (ﷺ) ئەفەرمێ (من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فمن لم يستطع فبلسانه، فمن لم يستطع فبقلبه وهو أضعف الايمان)

---

[١٨٢]- ئەم حدیثە ضعیفە.

واتە: هەر کامتان ناڕێکی و ناڕەواییەکتان دی با ڕێك بکاتەوە هێزو دەسەڵاتی بخاتەکارو بە بازووی بیگۆڕی.. خۆ ئەگەر نەیتوانی و دەسەڵاتی بەکارهێنانی هێزو بازووی نەبوو با بە زمان و هۆشیار کردنەوە خەڵکی و بە ئامۆژگاری هەوڵی ڕاست کردنەوەی خراپەکە بدات.. خۆ ئەگەر هەر نەیتوانی ستەمکاران باڵی ڕەشیان کێشا بوو بەسەر وڵاتدا و سیخوڕ و چڵکاو خۆرانی زۆریان بەردابووە خەڵکی ئەوە ئەبێ ئیش بکات بە دڵیی و بێز لە ستەمکاران بکاتەوەو ڕق و قین لە دڵیدا بڕوێنێ، بەڵکو ڕۆژێك ئەو خەشم و قینە بێتە کڵپەی شۆڕشێك، پێغەمبەری خوا ئەم قۆناغەی تێکۆشانە بە ( لاوازترین باوەڕ ) ناو ئەبات .

ج. ڕزگارکردنی ویژدانی موسڵمان لە ناوچەگەری و هۆز پەرستی و پێشێل کردنی ڕاستی لەبەر خاتری خزم و خوێش و دوورە پەرێزی لە ڕەگەز پەرستی: { وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُواْ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ } حجرات: ٩

واتە: ئەگەر دوو هۆزو کۆمەڵ لە موسڵمانان بوو بە ناخۆشیان و دەستیان چووەیەك، هەوڵ بدەن دۆخی برایەتییەکەی جارانیان بۆ بگێڕنەوەو نێوانیان ساز بکەن، جا ئەگەر هۆزێکیان دەست درێژی کردو بەو سازکردنە (شەرعی و ڕاستییە) ڕازی نەبوو

بەخۆڕایی هێرشی ئەهێنا بۆ ئەوی تر، پەلاماری چەکیان لێ بدەن و لێیان بکوژن (ئەگەرچی هۆزەکەی خۆیشت بێ) هەتا ئەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خواو دۆخی برایەتی و دۆستایەتی موسڵمانانە.

د. ئیسلام ویژدانی موسڵمان بە نێری و سەربەرزی پەروەردە ئەکات.. ویژدانی موسڵمان بە شێوەیەك لە بۆتەی خواپەرستیدا قاڵی ئەکات، بێجگە لە خوا سەر بۆ کەس شۆڕ ناکات و مافی ژیانی و مافی سنوری و مافی بونی خۆی بەخوێن ئەپارێزێ... بۆیە خوا فەرمانی ئەدا کە موسڵمان ئەبێ بەهێز بێ و دوژمنەکانی لێی بترسن: {وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ} الأنفال: ٦٠

واتە: هەتا لە تواناتانا هەیە هێزو دەسەڵات و چەك و پێویستی جەنگی لە دژی دوژمنانی ئیسلام ئامادە بکەن. هەر لە سەرە گوریسێی بەستنەوەی وڵاخ هەتا بەرزترین چەکی ئەو کاتە، بۆ ئەوەی دوژمنەکانی خواو دوژمنەکانی خۆتان بترسێنن.

هـ. مامۆستایەك ئەفەرمێ: (ڕەنگە دانانی شەیتان و ئەهریمەن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و باس کردنی ئەو هەموو دوژمنایەتییەی نێوان ئادەم و شەیتان و دەسەڵاتی شەیتان لەسەر مرۆڤداو هاتوچۆکردنی بە شا دەمارو خوێنهێنەرو خوێنبەری مرۆڤ، ئەمە

هەمووی بۆ ئەوەیە، ئەو وزە پیرۆزە بەتینەی لە گیانی مرۆڤدا هەیە بیخاتە گەڕو هەموو کاتێ ئامادەی شۆڕش و جەنگ بێ..)[١٨٣] جا بزانە بەهەشت گیان ئەو ویژدانەی لەژێر ئەم نەخشە پەروەردەیی و ئەم بۆتە شۆڕشگێڕییەدا قاڵ ببێ ئەبێ چ هێزێك لەم سەرزەویەدا بتوانێ سەری پێ شۆڕ بکات!.

و. نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، هەموو خواپەرستی و کردارە گەردن کەچییەکانی موسڵمان بۆ خوا.. هەر هەموویان هۆی پەروەردەکردن و بەهێزکردنی ویژدانن.. چونکە خواپەرستی لە ئیسلامدا هۆن نەك ئامانج، هۆن بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی بەرز، بۆ گەیاندنی موسڵمان بەو پلەیەی پێویستە بیگاتێ.. بۆیە پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ) لەبارەی نوێژەوە ئەفەرمێ (من لم تنهه صلاته عن الفحشاء والمنكر لم يزدد من الله إلا بعدا..)

واتە: هەر کەسە، هەر نوێژگەرێ نوێژەکەی نەبێتە هۆی گەڕانەوەی و جڵەوگیری لە کردەوەی ناپەسەندو ناڕەوا، هیچی دەست ناکەوێ جگە لە دووری لەخواوە نەبێ.. وە بۆ ڕۆژو ئەفەرمێ: (من لم يدع قول الزور والعمل به، فليس الله حاجة في أن يدع طعامه وشرابه) واتە: ڕۆژەوانێك دەمی خۆی نەگرێت لە

---

[١٨٣]- الانسان بين المادية والاسلام، ص١٢٠-١٢١.

گوفتاری ناشرین و درۆو کردەوەی ناپەسەند، خوا پێویستی بە نەخواردن و نەخواردنەوەی ئەو نیە..

بەم پەروەردە ناسکەو ڕێك و پێکەوە ئەبێ چ جۆرە مرۆڤێك پەروەردە بکرێ..؟ ئەبێ چ جۆرە کۆڕ و کۆمەڵێك بهێنرێتە سەر ڕووی ژیان بەڵێ ئەو کۆمەڵە پەروەردە کرا کە لە سەرەتای زێڕینی ئیسلام و کاتی هاوڕێکانی پێغەمبەر و شوێنکەوتووەکانی ئەوانیش وەك ئەستێرەی پرشنگدار عاسمانی مێژوویان ڕازاندۆتەوە، کاتێ کە ژیانی هەرکام لەو مەردانە سەیر ئەکەیت و دەنگ و باسیان، هەڵسان و دانیشتنیان ئەخوێنیتەوە وا نازانی باسی مرۆڤ ئەکەیت.. وا ئەوانی باسی فریشتەیەك ئەکەیت لە بەرگی مرۆڤدا، وا لە خوارەوە چەند هەڵوێست لەو ویژدان و باوەڕە پتەوە ئاودراوانەی کانیاوی قورئان و خواپەرستی باس ئەکەین.

١. هیچ هەڵوێستێکی سەرداری مرۆڤایەتی و مامۆستای ئادەمیزادان (محمد صلى الله عليه وعلى آله وصحبه أجمعين) باس ناکەین، چونکە پێغەمبەرێتی بەرزترین پلەی ژیانە کە مرۆڤ چنگی لێ گیر بووە.. پێغەمبەران کە قوتابی خوا بن و مامۆستاو ڕێنیشاندەیان خوا خۆی بێ، ئیتر ئەبێ بە چ گەزو تەرازوویەك بتوانین بیانکێشین.

٢. جارێك (عەلی كوڕی ئەبو تالب) (كرم الله وجهە) لە مەیدانی جەنگدا، دوای زۆرانبازی و بگرەو بەردە و هەزاران ترس و لەرز پاڵەوانێك ئەدا بە زەویداو لەسەر سنگی دائەنیشێ و لەو كاتەدا كە شمشێرەكەی ئەخاتە سەر ملی بۆ ئەوەی سەری ببڕێ، پاڵەوانە كافرەكە تفێك ئەكاتە ناوچاوی حەزرەتی عەلی، پاش نەختێك بیركردنەوە حەزرەتی عەلی لەسەر سنگی هەڵساو سەری نەبڕی و بەرەڵلای كرد، موسڵمانەكان سەرسام بون و لێیان پرسی ئەرێ ئەوە چۆن ئەو كافرەت بەرداو سەرت نەبڕی؟! فەرمووی: كاتێ دام بە زەوییداو ویستم سەری ببڕم تفێكی كردە ناوچاووم و منیش زۆر ڕقم داهات، دوایی سەیرم كرد ئەگەر بیكوژم لەبەر خوا نیەو لەبەرئەوەیە كە تفی لە خۆم كردووە، منیش نامەوێ كەس لەبەر خۆم بكوژم، ئەمەوێ خەڵك لەبەر (خوا) بكوژم و بەس.

٣. عثمانی كوڕی عەففان، لە كاتی خەلافەتی ئەبوبەكردا (خوا لە هەموویان ڕازی بێ) و كاتی گرانیەكی ناخۆش و قات و قڕییەكی سەخت، كاروانێكی بازرگانی هەبوو، كە هەمووی ئازووقەو خواردەمەنی بوو.. بازرگانەكانی شاری (مەدینە) هاتنە لای عثمان و وتیان ئەو كاروانەی تۆ هاتووەو ئێمە ئەمانەوێ بیكڕین، جا چۆنمان پێ ئەفرۆشیت..؟ فەرمووی: زیاتریان

داوە.. وتیان، درەمی بە چوار.. بە پێنج.. ئەدەینێ.. فەرمووی، زیاتریان داومەتێ،.. وتیان درهەمێ بە سێ.. فەرمووی: زیاتریان داوە.. وتیان: درەمی بە چوار.... بە پێنج.. عثمانی خوا ویست فەرمووی ئاخر زیاتریان داومێ وتیان، تۆ پیاوی درۆ نیت بەڵام ئێمە هەموو بازرگان و پارەدارانی شارەکەین و کێ هەیە بتوانێ بەسەر ئێمەدا زەم بکات..؟ فەمووی.. خوا، بەری هەر درەمێك دە درەمی داومەتێ و فرۆشتوومە بە خوا.. عثمان فەرمانی ئەدا هەموو کاروانەکە بە خۆڕایی ببەخشنەوە بەسەر هەژارەکانداو حوشترەکانیش سەر بڕن و گۆشتەکەی ببەخشن.

٤. (خالدی کوڕی وەلید) ئەو فەرماندە موسڵمانەی لە هەموو سەراسەری ژیانیدا شکستی نەزانیوەو هەموو کاتێ سەرکەوتوو بووە.. لە یەکێ لە جەنگە گەورەکانی ئیسلام لەگەڵ کوفردا کە (خالد) سەرکردەی سوپای ئیسلام بوو (سا لەبەر هەر هۆیەك بوو) (عمری کوڕی خطاب) (خوا لە هەموویان ڕازی بێ) فەرمان دەرئەکات (خالد) لە سەرکردایەتی ئەخات و سەرکردەیەکی تازە لە سەربازەکانی ژێر دەستی خالد دائەنێ و لەو گەرمەی جەنگەدا فەرمانەکە ئەدەن بە (خالد)، هیچ خۆی تێك نادات و بۆڵەو ورتەی لێ نایەت و مەیدانی جەنگ بەجێ ناهێڵێ (کە زۆر

لێی ڕوونە تاوانێکی نەکردووە شایانی هیچ جۆرە سزایەك بێ چ جای دەرکردنی لەسەرکردایەتی) سەیری کرد ئەگەر ئێستا و لەم کاتە ناسکەدا سەرکردایەتی بەجێ بهێڵێ، دوور نیە لەشکری خواناسان بشکێنن، بۆیە هەر خۆی سەرپەرشتی جەنگەکەی کرد.. فەرمانەکەی خەلیفەی دەرنەخست هەتا موسڵمانەکان سەرکەوتن بەسەر سوپای کوفردا، دوای سەرکەوتن، سوپاکەی کۆکردەوەو فەرمانەکەی خەلیفەی خوێندەوەو سەرکردایەتی دایە دەستی سەرکردەی تازە، ئەی خۆی چی کرد..؟

قوماندەرێکی وەکو خالد بێتاوان لە سەرکردایەتی بخرێ.. ئایا ڕەوایە لەو سوپایەدا بمێنێ سەرکردەی بووە.. بەڵێ ئەبێ وەکو سەربازێکی گوێڕایەڵ و سەربازێکی ئاسایی بمێنێتەوە.. چونکە ویژدانی لە بەرزترین پلەی پشوو دڵنیاییدایەو خوای لێ ڕازییە، ئیتر باو بژی قسەی خەڵکی چ نرخێکی هەیە!!!.

بەڵێ (خالد) وەکو سەربازێکی ئاسایی و بێ هیچ پلەیەکی سەربازی و بە دڵێکی پڕ لە باوەڕەوەو ویژدانێکی ئاسوودەوە مایەوەو نموونەی سەربازی فیداکاری و گیانبازی بوو.

٥. لەم ڕۆژگارە تازەی سەردەمەی خۆماندا.. ( شێخ علاءالدین )ی بیارە باخەوانێکی ئەبێ ماوەی شەش حەوتساڵ باخەوانی یەك باخە هەنار ئەبێ، ڕۆژێك شێخ تەشریف ئەبات بۆ ئەو باخەو

هەندێ مامۆستای ئایینی و خەڵکی تری لەگەڵدا ئەبێ.. بانگ ئەکاتە کابرای باخەوان و ئەفەرمێ:

ئا سۆفی فلانەکەی خێری خۆت بازێ هەنارمان بۆ بێنە بەلام با شیرین بن.. عەرزی ئەکات: قوربان نازانم کامانە شیرین و کامانە ترشن.. شێخ ئەفەرمێ: ئەو بنە هەنارەی لێت خواردووەو شیرین بوو ئەوە شیرینەو لەوە بۆمان بێنە.. عەرزی ئەکات: قوربان ئاخر تا ئێستا لە هەناری ئەم باخەم نەخواردووەو شیرین و ترشیان ناناسم.. شێخ بە سەرسوڕمانێکەوە ئەفەرموێ: چۆن تا ئێستا لەم هەنارانەت نەخواردوو خۆ تۆ شەش حەوت ساڵە باخەوانی ئەم باخەیت و لەگەڵ بنجە بنجەیاندا ژیاویت.. عەرزی ئەکات: قوربان من هاتووم باخەوان بم نەهاتووم هەنار خۆر بم.

کام ویژدان پەروەری سەرزەوی ئەگاتە پلەی ئەم سۆفییە باخەوانە.. باخەکە باخی خێرەو باخی خانەقایە شێخ علاءالدین بەو هەموو گوستاخی و دڵفراوانییەوە کەچی ئەو سۆفییە ویژدانی ڕێگای خواردنی تاقە هەنارێکی لەماوەی شەش حەوت ساڵدا نەداوە.. بەڵێ ڕەنگە (هەر لە بنەماڵەی شێخ خۆیدا) هەبێ بڵێ (ئەم سۆفییە گێل بووە) چونکە ئەم خۆی لە مانای ژیان نازانێ.. نە ئەو تامەی ژیانە ئەزانێ، نە پلەی ئەو ویژدانە ئەزانێ بۆیە لە جیهانە ماددییەکەی خۆیەوەو ڕوانگە تەسکەکەی

خۆیەوەو، ورگە (مەشکەی عارەقە)کەی خۆیەوە سەیری ئەو سۆفییە دەروون فراوانەو ئەو ئاسۆ بەرزە ئەکات.

٦. مامۆستا موسڵمانەکانی (هیندستان) أبو الحسن الندوی لە کتێبە بەنرخەکەی (ماذا یخسر العالم بانحطاط المسلمین، لاپەڕە ٢١٥)دا ئەڵێ: (ساڵی ١٨٥٧ی زاینی شێخ رضی الله ی بەدەوانی کە لەگەڵ کۆمەڵێ موسڵماناندا لە هیندستان بە شۆڕشێکی بڵێسەداری بەربلاّو هەڵسابون، گیراو درا بە دادگایەکی (دژی داد)ی ئینگلیزی، کەچی سەرۆکی ئەو دادگایە کاتی خۆی قوتابی مامۆستا بەدەوانی بوو.. ڕایسپاردە لای مامۆستا ئەگەر لە دادگادا لاری هەبێ لە تاوانەکەی و بڵێ من شۆڕشم دژی ئینگلیز نەکردووە ڕزگاری ئەکەم.. شێخ فەرمووی هەرگیز واناڵێم و چی ئەکەن با بیکەن و من دژی ئینگلیزی داگیرکەر شۆڕشم کردووەو نەنگیم نیە.. درا بە دادگاو فەرمانی خنکاندی بەسەردا درا.. کاتێ هێنرایە بەر سێدارە بۆ تاساندن.. سەرۆکی دادگا کە دەستی کرد بە گریان و وتی مامۆستا ئێستایش بڵێی من نەبووم و من شۆڕشم نەکردووە ڕزگارت ئەکەم.. مامۆستا لێی تووڕە بوو وتی ئەتەوێ کردەوەکەم بەدرۆ لیخن بکەن، بەڵێ من شۆڕشم کردووەو شانازی پێوە ئەکەم و چی ئەکەن با بیکەن..

بە ڕوو سووری پەتەکەی کرایە مل و بووە بەنزینی شۆڕشی دەرپەڕاندنی ئینگلیز.

٧. نمونەی هەڵکەوتووانی خاوەن ویژدانی خواپەرست زۆر زۆرترە لەوەی بە هەزاران نوسراوو دانیشتن و کوڕ باس بکرێن بەڵام ئەوەندە ئەڵێم کاتێك کە کۆمەڵ و ئەندامانی کۆمەڵ بە خەڵفی باوەڕ بە خواو شوێنکەوتنی قورئان ویژدانیان موتوربە کرد، چۆن کۆمەڵێك دەرئەچێ.. ئەزانی چۆن کۆمەڵێ دەرئەچێ..؟

**بەهەشت:** چۆن کۆمەڵێك..؟

هەرچەندە ئیسلام و سێبەری ئیسلام لە هەر جێگەیەك پەخش بوویەوە پێویست ناکات باسی کامەرانی و بەختیاری ئەو گەلە بکرێت، چونکە لە هەتاو دیاریترە.

**نەوڕەسی:** زۆر ڕاستە خوشکە خۆشەویستەکەم بۆیە.. لەشکری ئیسلام ڕووی ئەکردە هەر جێگایەك زۆرتری دانیشتوانی وڵاتەکە پێشوازی و بەخێرهاتنیان لێ ئەکرد..

لە هاتنی لەشکری ئیسلام بۆ وڵاتی شام و کاتێك گەیشتنە شاری (حمص) هەواڵ گەیشتە (ابو عوبەیدە)ی سەرلەشکر کە سوپای (ڕۆم) بە هێزێکی گەورەوە هاتوون بۆ شەڕ لەگەڵ موسڵمانان.. ئەبو عوبەیدە خەڵکی شارەکەی کۆکردەوەو

فەرمووی (هەواڵمان پێگەیشتووە کە سوپای (ڕۆم) هاتووەو ئێمەیش نامانەوێت لەناو شاردا جەنگ بکەین و وا شارتان بۆ جێئەهێڵین و خواحافیز..) لەشکری موسڵمانەکان شارەکەیان بەجێهێشت بەڵام ڕەوشتە بەرزەکانیان لەسەر گڵەکان مۆری خۆشەویستیان هەڵکەند بوو.

ئایا ئەزانی خەڵکی شاری (حمص) چییان کرد..؟

**بەهەشت:** چییان کرد..؟

**نەوڕەسی:** هاتن دەرگای شاریان لەسەر لەشکری (ڕۆم) داخست و نامەیەکیان نووسی بۆ (ئەبو عوبەیدە)و..

**بەهەشت:** باشە کاکە گیان دانیشتوانی ئەو کاتەی شام گاور بون ولاتی ڕۆم و میریی و سوپای ڕۆم گاور بون..

**نەوڕەسی:** بەڵێ لەگەڵ ئەوەشدا نووسیبوویان..

( ئەی کۆمەڵی موسڵمانان ئێوە خۆشەویستترن لامان و بەرزترن لامان لە (ڕۆم) ئەگەرچی ئەوان لەسەر ئاییني خۆمانن، ئێوە ڕاستترن لەگەڵماندا دڵنەرم ترو بە بەزەیی ترن لەگەڵمان، زیاتر لەوان بەرگری ستەممان لێ ئەکەن و جوانتر لەوان سەرپەرشتیمان ئەکەن.. ئەوان زاڵ بون بەسەرماندا و دەستیان گرتووە بەسەر خۆمان و ماڵ و منداڵماندا، بۆیە ناچار بووین دەرگای شارەکەمان (حمص) بەڕووی سوپاکەی (هرقل) دابخەین و دانیشتوانی شار

بڕیاریاندا کە ئاگاداری موسڵمانەکان بکەن و سەرکردایەتی ئەوان و دادپەروەری ئەوانمان پێ خۆشترە لە ستەمی (اغریق) و چەوساندنەوەیان )[184]... بەهەشت گیان پێم ناڵێیت ئایا گەلی ئەفغان و خەڵکی ئەفغانستانیش لە ساڵی ١٩٧٨دا بەو شێوەیە پێشوازیان لە سوپای سووری داگیرکەرانی ڕوسیا کرد..؟! یان گەلی ڤێتنام بەو شێوەیە پێشوازیان لە سوپای ئەمەریکای خوێنمژ کرد..؟!

بەڕاستی بەهەشت گیان مرۆڤایەتی کاتێ قوڕی ڕەشی بۆ گێرایەوە ویستیان بە سەرو بەریەوە بیخەنە ئەزموونگەو ئەوی لە ژێر میکرۆسکۆبدا نەبینرێت ئەوە لاوەکیە لە مرۆڤایەتی و بۆی هەڵبەستراوە.. ئەو ڕۆژە هەشی بەسەردا کرا کە مرۆڤ وەکو ئامێرێکی ئابووری ڕووت سەیرکراو ژیانی و هەموو کونج و کەلێنێکی ژیانی ئابوورییەکی ڕووتەو سفر بە دەستەوە.

ئایا ڕاستە مرۆڤ تەنیا سێ قسە، یان تەنیا ئامێرێکی ئابوورییەو بەس!؟

ئایا ویژدان و ڕەوشت و ئایین و مرۆڤایەتی.. هتد.. هەمووی پڕوپووچ و ئەفسانەو چاوو ڕاوە..؟

---

[184]- نظرية في دراسة التاريخ الاسلامي، ص٧٥.

ئایا بانگەوازی ئەم هەموو پێغەمبەرانەو بەرنامەی ئەو هەموو پێشەواو پیاو چاکانە هەموویان دەستەواژەی خەڵەتاندنن..

ئایا ئەو هەموو پیاوە گەورانەی مێژوو دوورو درێژی گرۆی ئادەمیزاد، لە هەموو ڕەنگێك و لە هەموو ئایینێك و لە هەموو نەتەوەو هۆزو کۆڕێك، ئەوانەی کە بەرژەوەندی خۆیان و هەرچییەکیان بووە لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا کردیانە قوربانی و هەرچی داخوازی لەش و خۆشگوزەرانی و جیهانپەرستی بوو خستیانە ژێر پێیان و خۆیان دایە دەستی ویژدان و بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست و بونە نموونەی پاکی و خاوێنی بەزەیی و دڵسۆزی.. ئایا ئەم پیاوە گەورە گەورانەی کە هەر یەکیان ئەڵێی کێوێکی بەرز و بڵندو سەرکەشن و ئەڕوانن بەسەر جیهان و دەشتی ماددییەتداو پێی پێئەکەنن.. ئایا ئەمانە هەموویان پڕوپووچن..؟!!

ئەبو بەکرو عومەرو عەلی و حەسەن و حسێن...ئەبو زەڕو عومەری کوڕی عبدالعزیز.. ئەختاتون و بوزاو غاندی و هەزاران و ملیۆنانی تری مرۆڤان.. هەموویان کەف و کوڵ و تارمایی هیچ بون..؟

ئەو هەموو ئەستێرەو مانگ و خۆرە پرشنگدارانەی کە ئاسمانی مێژوویان وشەدارو پرشنگدار و ڕووناك کردووە..

ئایا ئەمانە هەموویان هیچن و چەند هەتیوە جوو و جاش جوویەك نەبێ کە هەموو ژیانیان لە پشێوی ناو گەلان و هەزار بەرەکی نانەوە پارت پارتێنەو خواردنەوەی عارەق و داوێن پیسی و چاوچنۆکیدا بەسەر بردووە..؟!

نەخێر، بەهەشت گیان ڕێزو بەرزی مرۆڤ بە چوونە ناو مانگ و مەریخ و تەنانەت ناو هەتاویش نیە.. نرخی مرۆڤ دابین ناکرێ بە ڕادیۆو تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ.. دابین ناکرێ بەوەی خاوەنی ئۆتۆمۆبیل و فڕۆکەو ڕۆکێت بێ.. دابین ناکرێ بەوەی خاوەنی ناپالم و بۆمبای ئەتۆمی و بۆمبای هایدرۆجینی و بۆمبای سوتێنەرو چەکی دژی مرۆڤ بێ.. نەخێر تەرمۆمەتری مرۆڤایەتی بەوانە بەرز نابێتەوە.. بەهەشت گیان ڕۆژێك دێت هەموو دەسەڵات و ماسولکە ئەتۆمییەکانی ئەمەریکا و ڕووسیا فڕێ ئەدرێتە سەرەلوێنکی مێژوو ئەبنە ژێر تف بارانی مرۆڤایەتییەوە.. بەڵام کەی کاتێ کە ویژدان لە دڵەکاندا چەکەرەی کردوو ڕووا..

## ده‌روون و فرۆید :

به‌هه‌شت: هه‌رچه‌نده ئێمه نامانه‌وێ خۆمان بخه‌ینه گێژاوی فه‌لسه‌فه‌ی وشك و نه‌زۆك و كوناو كون و، ئه‌مانه‌وێ به‌شێوه‌یه‌كی قورئانی باسه‌كه‌مان ڕۆشن بكه‌ینه‌وه.. به‌لام كاكه گیان حه‌ز ئه‌كه‌م هه‌ندێ ڕای فرۆیدم له‌سه‌ر (ده‌روون = نفس) بۆ باس بكه‌ی و زۆر به په‌له‌و به‌كورتی ڕای ئیسلامم بۆ باس بكه..

نه‌وڕه‌سی: خوشكه شیرینه‌كه‌م... ده‌روون و زانیاری ده‌روونناسی زانیارییه‌كی فره‌ڕوو قوڵ و به‌ربلاوه‌و به ده‌یان قوتابخانه‌و ڕای جیاجیاو زانایانی به‌رز به‌رزی تێدا پساوه‌و هیچی نه‌كردووه به هیچ.. وه‌كو خۆت وتت حه‌ز ئه‌كه‌م ئه‌و مه‌سه‌لانه‌ی كه ئێمه باسیان ئه‌كه‌ین له‌سه‌ر شێوازی قورئان باسیان بكه‌ین و خۆمان تووشی كوناو كون و بگره‌و به‌رده‌ی وشكی فه‌یله‌سووفه‌كان نه‌كه‌ین.

به‌هه‌شت: منیش ئه‌وه‌م ئه‌وێت كه ئه‌وه‌نده‌ی په‌یوه‌ندی به مه‌سه‌له قورئانییه‌كانه‌وه هه‌یه بۆم باس بكه‌یت.. له پێشدا كورته‌یه‌كی ڕای فرۆید له باره‌ی ده‌روونه‌وه.

نه‌وڕه‌سی: به‌چاوان خوشكێ گیان.

لای فرۆید ده‌روون (نفس) پێك هاتووه له:

١. هەست = الشعور = ئەویش ئەو بەشەی دەروونە کە بریتی یە لە خودی = ذات = ( Ego ) ئەمەیش کە ئەمانبەستێت بە جیهانی بیرکردنەوەو بیرەوەرییەوە[١٨٥].. وە هەوڵ ئەدات بە پێك هێنان و سازاندنی نێوان ئارەزووە دژەکانی دەروون[١٨٦] لەگەڵ جیهانی واقیع.

٢. ئەودیوی هەست = اللا شعور = ئەمەیش دوو لای دەروون ئەگرێتەوە، لایەکی داخوازی بایۆلۆجی و هێزی جنسی کە بە زاراوی دەروونناسی پێی ئەڵێن (نزمەمن = نزمەخود = ID) وەکو لاکەی تری بریتییە لەو خۆزگەو ئاواتە خەفەکراوانەی کە بە نهێنی کارەکانی خۆی ئەنجام ئەدات[١٨٧].

٣. بەرزەمن = الأنا العليا = Supar ego = کە لە زاراوەی فرۆیدیزم بە ویژدان و کارەکانی ویژدان ئەناسرێ.. بەپێی فەرهەنگی فرۆیدیزم ئەم هەستە لەکاتی منالی و حەزکردنی کوڕ لە دایکی و کچ لە باوکیدا و خەفەکردنی ئەم هەستە لە دەروندا دروست ئەبێ.

---

[١٨٥] – مجلة آفاق عربية، العدد ٩، السنة ٣ آيار ١٩٧٨، ص٧٧.

[١٨٦] – الأنسان بين المادية والاسلام، ص٣٢.

[١٨٧] – هەمان گۆڤارو ل٧٨و سەیری کتێبی فەلسەفەی جوانی و هونەر ل٣١٨–٣٢١ بکە.

دیـاره دژایەتییـەکی نـەبڕاوه هەیـە لـەنێوان نزمـەمن = ID و (بـەرزەمن = Supar ego) دا چـونکه (نزمـەمن) هـەر هەڵپـەی تێرکردنـی داخوازییـەکانی (غەریزه)یـە، بـەڵام (بـەرزەمن) هـەوڵی دروستکردنی کەسایەتێکی ئایدیالی و پەیوەندی و چەسپاندنی بەنـدوباوی کۆمەڵـە. بـەکورتی کـارو فرمـانی دەروون لـەڕووی فرۆیدیزمـەوه بریتییـە لـە هەڵگیرسـاندنی جـنس و خەفـەکردنی جنس و هەروا..

بەهەشـت: ئەی تـۆ ڕات چۆنەو چی ئەڵێیت، یـان باشتر بڵێین ڕای ئیسلام بەرابەر بە دەروون چییە..؟

نەوڕەسی: خوشکەکەم

١. فرۆیـد هەرچـی لەسـەر مـرۆڤ و دەروون و شـیتەڵ کردنـی دەروون نووسیوه هەمووی لـە مرۆڤـی نائاسایی و نەخۆشـەکانی خۆی نوسیویەتی، ناکرێتـە کاڵای باڵای هـەموو دەروونـی مـرۆڤ بەگشتی.

٢. مەسـەلەی بگـره و بـەردەی نـاو دەروون شـتێکی ڕوونـەو پێویستیمان بە مامۆستایانی فرۆید و کەس نیـە.. مـرۆڤ وەکو پارچەیەك لەم بونەرەوه و بەڵکو مـرۆڤ خۆی وەکو بونـەوەرێکی بچووك دیارییـە لـە کێشـمەکێش و بگـرەو بـەرده بێبـەش نیـە.. ئـەوەتا هـەر لـە گەشـت و گـەڕان و ئەسـتێرەکان و لێکـدان و

پێکدانیان.. هەر لەو جەنگە خوێناویەی ناو دەریای هێمن، مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤ لەگەڵ خۆی و کەسوکارو دەوروبەری و سروشتی دەوروبەری.. دەروونیش دروست کراو پەیوەستەی ئەو سروشت و مرۆڤەیەو بگرەو بەردە شتێکی ئاساییەو.

٣. ئەم بەش بەشکردن و شیکردنەوەی فرۆیدە لە ئیسلام دزیویەتی بەڵام لەگەڵ لیخن کردنی باس کردنی گۆڕینی ناوەکانی (نزمەمن = ID) بریتیە لە (النفس الأمارة) و (خود = Ego) بریتیە لە (النفس اللوامە) وە (بەرزەمن = Supar ego) بریتیە لە (النفس المطمئنة)[١٨٨].

٤. نامەوێ باسی ڕای فەیلەسووفەکانی یۆنان و فەیلەسووفانی ئیسلامت بۆ بکەم بۆ ئەوەی (دەروون)ت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بۆ باس بکەم.. وە نامەوێ ڕای سۆفیە خواناسەکانی خۆمانت وەکو (غزالی و فارابی و ئیبن مەسکویە و کندی و ڕازی و یەحیای کوڕی عەدی و ئیبن سینا)و هەزارانی تر زاناو بیرتیژی موسڵمانان کە هەر یەکەیان خاوەنی قوتابخانەو زانیارییەکی تەواون لەبواری دەروونناسیدا نامەوێ ڕای ئەمانەت بۆ بهێنمەوە، بۆ ئەوەی تووشی تەپ و تل و گێژو خولی فەلسەفەو

---

[١٨٨]- الاسلام وقضايا علم النفس الحديث، ص٥٥.

جیهانە ئاڵۆزەکەی نەبین. تەنیا ئەوەندە ئەڵێم (دەروون) لە ڕوانگەی ئیسلامەوە:

ا. شتێك نیە جیا لە مرۆڤ و زاڵ بەسەر مرۆڤدا.. بەڵکو پارچەیەکە لە مرۆڤەکەو مرۆڤ دەسەڵاتدارە بەسەریدا و ئەتوانێت چۆن بیەوێت پەروەردەی بکات ئەیکات.. بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێ[189]: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾ الشمس

کەواتە دروستکەرو کرداری دەروون ڕێگای چاك و خراپ و گوێڕایەڵی سەرکەشی بۆ خۆش کردووە بەدەست خاوەن دەروونەکەیە . مرۆڤ .

ب. دەروون لە ڕوانگەی قورئانەوە سێ جۆرە:

١. دەروونی سەرکەش و ئابڕووبەر = کە خاوەنەکەی هان ئەداو بۆ خۆپەرستی و داوێن پیسی لایەنە ماددیەکەی مرۆڤ..

{ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِيٓ ۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓ } یوسف: ٥٣

---

[189] – واتە: (سوێند بە دەروون و ئەو کەسەی دەروونی دروست کردووەو خۆشەی کردووە ... ڕێگای بۆ خۆش کردووە بۆ ئەوەی بیەوێ تاوانبار بێ یان لەخواترس و سەربەست... بەوەش سەرکەوتوو ڕزگارە ئەوی دەروونی پاڵفتەو خاوێن بکات.. وە تێکشکاوە ئەوی فەرامۆشی بکات و ژێر پێی بخات.

یوسف پێغەمبەر فەرمووی واتە من ناڵێم دەروونم پاکەو بێ خەوشە چونکە دەروون زۆر فەرمان ئەدا بە خراپەکاری و بەدڕەوشتی مەگەر دەروونی یەکێ کە خوا بەزەیی پێدا بێتەوە ڕامی بکات.

٢. دەروونی هاندەر بۆ کاری چاکەو ڕەوشت بەرزی: کە لە زاراوەی ئەمڕۆی خۆماندا پێی ئەڵێن (ویژدان) و قورئان پێی ئەفەرمێ (النفس اللوامە) وەکو لەپێشەوە باسمان کرد.

٣. دەروونی دڵنیا = النفس المطمئنة.. ئەمەیش بەرزترین و ئاسوودەترین دەروونەو بریتییە لە پەرژینێك بۆ خاوەنەکەیی و ناهێڵێ تووشی خراپەکاری بێ.. دیارە لەبەرئەوەیە خاوەنەکەی هەر لە سەرەتاوە لەسەر پاکی و ڕەوشت بەرزی ڕای هێناوە و پەروەردەی کردووە.. بۆیە خوای گەورە بەو دەروونە خاوێنەو لەکاتی ماڵ ئاوایی لەم جیهانەو ژیانە پێی ئەفەرموێ:

{وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٦﴾ يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَـٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾} الفجر

واتە: ئەی دەروونە دڵنیاکە، بگەڕەوە بۆ لای خوای خۆت بەشێوەیەك کە تۆ لە خوای خۆت ڕازی و خوایش لەتۆ ڕازییە،

بڕۆ ناو ڕیزی بەندە خۆشەویستە پاکەکانی خۆم و بڕۆ بۆ بەهەشتەکەم[١٩٠].

بەهەشت گیان ئەوەندەی ئێمە کارمان بە باس کردنی دەروون هەیە ئەوەیە هەر کەسە توانی زاڵ بێ بەسەر دەروونی داو فەرمانی دەروونی بەدەس ئەمەوە بێ ئەوە لە ژیانیداو لەبەردەم دادگای خواییدا سەرکەوتووە.. خۆ ئەگەر جڵەوی ئەم بە دەست دەروونی و ئارەزووکاری دەروونییەوە بێ ئەوە ڕەجاڵ و ماڵوێرانی هەردوو جیهانە.. بەهەشت گیان بەڕاستی زاناو فەیلەسووفی بەناوبانگ ئیفلاتوون جوانی وتووە کە ئەڵێ دەروونی مرۆڤ وەکو گالیسکەیەك وایە کە دوو ئەسپ ڕایکێشێ یەکێك لە ئەسپەکان گوێڕایەڵ و بەخشندەو نەرم و نیانەو ئەو ئەسپەکەی تر شەڕانی و کەللە ڕەق و سەرسەختە.. عەرەبانە چییەکە ژیری مرۆڤەکەیە کە زاناو داناو فەیلەسووفە.. ئەسپە گوێڕایەڵە بەخشندەکە (دڵ) ئەو دڵە کە کان و لانەی خۆشەویستی و هەموو هەستێکی پاك و بێ گەردی وەکو خۆگری و ئارام گرتن و ئازایەتی و بەخشندەیی و هتد.. یە..

---

[١٩٠]- الاسلام و قضايا علم النفس الحديث، ص٦٩-٧٠.

ئەسپە سەرکەشەکەیش شەهوەت و غەریزەو māddه پەرستیەکەی مرۆڤە (هێندەی شەهوەت و ئارەزووکاری) کە هەموو هەڵپەیەکی بۆ کۆکردنەوەی دارایی و ڕابواردن و دنیاپەرستییە)[١٩١].

[١٩١]- خلاصة علم النفس، ص٥.

## ڕەوشت لە ڕوانگەی فرۆییدییەوە :

بەهەشت: کاکە گیان جا ئەمشەو مەسەلەی ڕەوشت و کێشەکانی ڕەوشتی لەڕوانگەی فرۆییدییەوە ئەکەینە شەوچەرەو کۆڕەکەمانی پێ گەرم ئەکەین.. بەڵام پێش ئەوەی تۆ هیچم بۆ باس بکەیت ئەزانم گەورەترین چاکی زایۆنی بۆ ڕوخاندنی قەڵای ڕەوشت لەناو لاوان بەگشتی و لاوانی ئەوروپا بەتایبەتی، فرۆید و فرۆیدیزم بوو..

ئێستایش ئەو بەندەی (پرۆتۆکۆلات)ی زانایانی زایۆنیزم لە گوێمدا ئەزرنگێتەوە کە ئەڵێ (پێویستە لەسەرمان (جوولەکە) هەوڵێکی بێ وچان بدەین بۆ ئەوەی ڕەوشت لە هەموو جێگایەك بڕوخێنین، ئەوکاتە بە ئاسانی زاڵ ئەبین و بە ئاسانی خەڵکی ئەخەینە ڕکێفمانەوە.. فرۆید لە خۆمانە.. کاری سەرەکی ئەوەیە ئەبێ هەتا پەچە لەسەر کاری جنسی لابداو دۆخێك دروست بکات، کوڕو کچ بەڕۆژی نیوەڕۆ (لەبەرچاوی خەڵکی) بەو کارە هەڵسن و سواری یەکتری بن، بۆ ئەوەی لای لاوان و گەنجان هیچ شتێکی پیرۆز نەمێنێ و هەموو هەوڵ و هەڵپەو ئامانجێکی تەنیا تێرکردنی ئارەزووی جنسی بێ.. ئەو کاتە ڕەوشتی ئەو لاوە ئەڕوخێت )..

کەواتە دیارییە کابرایەك کە ئەرکی سەرەکی لە ژیانیدا ڕوخاندنی ڕەوشت بێ ئەبێ ڕای بەرابەر بە ڕەوشت و هەڵوێستی بەرابەر ڕەوشت چی بێ..؟

بەڵام هەر حەز ئەکەم هەندێ ڕای فرۆیدم لە بەرابەر ڕەوشتەوە بۆ باس بکەی.

ئەوڕەسی: بەچاوان خوشکێ گیان.

١. فرۆید ئەڵێ (مرۆڤ ناتوانێ خۆی پێبگەیەنێ و بێتە خاوەنی خۆی هەتا بە ئارەزووی خۆی هەستی جنسی و غەریزەی جنسی تێر نەکات، وە هەر کۆتێك لەلایەن ئایین یان ڕەوشت یان کۆمەڵ یان نەریت و بەند و باو بکرێتە مل کاری جنسی کۆتێکی نابەجێ و نا هەقە و ڕوخێنەری وزەی مرۆڤن.. خەفەکردنێکی ناڕەوایە..)[١٩٢].

٢. لای فرۆید (هەموو دڵە تەپە و نەخۆشییەکانی دەروونی و شێتێتی هۆی ئەو مادە ژاراوییە تاڵە ناخۆشەیە کە پێی ئەڵێن ڕەوشت )[١٩٣].

---

١٩٢- جاهلية القرن العشرين، ص١٨٨-١٨٩.

١٩٣-کتێبی ( The ego & the id)ی فرۆید ل٧٩-٨١ کتێبی (الانسان بين المادية والاسلام) ل١٠٩.

٣. فرۆید ئەڵێ (ڕەوشت مانای دڵڕەقی و سزادان ئەبەخشێ، تەنانەت لە نزمترین پلەی ئاسایی خۆیشیدا)[١٩٤].

٤. لای ئەوان کۆمەڵ دانەری ڕەوشتەو ئەگیان ڕەوشت بەرزی و ڕەوشت نزمی پەیوەندی بە سروشتی مرۆڤایەتییەوە نیە.. ئەگەر کۆمەڵگای فلانە شوێن وتیان ئەو شتە باشە، وا باشە.. وتی خراپە، و خراپە.. ئەگینا ڕەوشت خۆی نرخێکی سەربەخۆی نیەو بەڵکو ڕەوشت ڕەنگدانەوەی کۆمەڵە[١٩٥].. وە (دۆرکایم)ی جوولەکە ئەڵێ (کۆمەڵ خۆی خاوەنی دەسەڵاتی ڕەوشتیەو بە ئارەزووی خۆی بەندو باوی ڕەوشتیمان بەسەردا ئەسەپێنێ.. من هیچ پاشەکەوتێکی ڕەوشتی یان ژێر خانەیێکی ڕەوشتیم لە مێژوودا نەدیوە کە پەیوەندی بە سروشتی مرۆڤەوە هەبێ بەڵکو هەمووی بەند و باوی کۆمەڵە..)[١٩٦]

٥. لای فرۆیدیزم ڕەوشت کۆتە.. کۆتێکە مرۆڤ شەتەك ئەدا و ناهێڵێ شەقڵی کۆسپەکانی پێشکەوتن بشکێنێ جوولەکە هەموویان لەسەر ئەم تاکە تارە لێ ئەدەن و مەبەستیشیان ڕەوشتی ئێمەیە.. ئەوەتە (مارکۆز)ی جوولەکە لای وایە (هیچ

---

[١٩٤] - الانسان بين الماديه و الاسلام، ص٤٤.

[١٩٥] - هەمان سەرچاوە ل١٤٤.

[١٩٦] -الاسلام وقضايا علم النفس الحديث، ص٦٠.

شۆڕشـێکی کۆمەلاّیـەتی سـەر نـاگرێ پـێش هەڵگیرسـاندنی شۆڕشـی جنسـی و پێویسـتە پێش هـەموو شـتێك شۆڕشـێکی جنسی بکرێت و قەلاّی ڕەوشت و ڕەوشت پەروەری بڕوخێنرێ بۆ هەڵهێنانی یەکەم شەقا و لەڕێی ڕزگاری مرۆڤدا[197].

٦. دیارییە سەربازە جەنگاوەرەکانی ڕەوشت، ئایین و پیاوانی ئایینی و ڕۆڵـەی ئـایین پـەروەرە، لەبەرئـەوە هـەر نەخشـەیەك بکێشرێ بۆ لێدانی ڕەوشت، لێدانە لە ئایین و خواپەرستی بۆیە لـە سـاڵی ١٨٩٩دا (ماسـۆنی)یە جووەکـانی پۆڵۆنیـا وتیـان (پێویستە لەسەرمان . جوولەکە کە ئافرەت چەپەڵ بکەین و بەرگی خووڕەوشتیان لەبەر داماڵین بۆ ئەوەی سەر بکەوین و هەموو هێرشەکانی ئایین بۆ سەرمان پرش و بلاّو بکەین[198].

٧. ئـەم تیـۆرو هەڵوێسـتانەی جوولەکـە بەگشـتی و فرۆیـد بەتایبەتی بـووە هـۆی ڕوخـاندن و تێکدان و ژێـرەو ژوورکردنـی قەلاّی ڕەوشت لە ئەورووپاو تۆزو چەڕەدووکەڵی ئەو بێڕەوشتیە خەریکە ئاسمانی شینی پاك و بێگـەردی کوردسـتان . قەلاّی شـەرەف و ڕەوشـت ـ لـیخن ئـەکات.. بـەناوی پێشـکەوتن و

---

[197] – مجلة آفاق عربية، العدد١، السنة٧، ص٧٤-٧٥.

[198] – السر المصون في شيعة الفارمسون، لويس شيخو اليسوعي، ص٦٢، ط، بغداد عن مجلة أحياء التراث العربي الاسلامي، العدد ١٢، السنة ٣، ص٨٦.

پێشکەوتن خوازییەوە هەزاران لوغم و مین لەژێر پایەکانی شەرەف و ڕەوشت و نەریت و بەند و باوی کوردەواری پاك و بێگەرددا دانراوە.

بەهەشت: ئێستا ئەم هەموو گلەیی و بناشتانە چیە لای من ئەیکەیت.. هەموویان ئەزانین ئەوەندەی پیلان و نەخشەی دۆزەخی داڕێژراوە بۆ کافر کردنی کوردو وێران کردنی کوردستان لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە بۆ هیچ ناوچەیەك و پارچەیەك و هەرێمێکی تری ولاتی پان و پۆڕی ئیسلامی، دانەنراوە.. تۆ ئەڵێی چی دەربارەی فرۆید و ڕەوشت..؟

نەوڕەسی: دیاریبە زانیاری دەروونناسی پابەندە بە زانیارییەکی ترەوە کە ئەویش زانیاری ڕەوشت ناسییە، یان ڕاستتر بڵێین هەر یەکەیان ڕووی دووهەم و تەواوکەری ئەوی تریانە.. هەر کردەوەیەك ڕەنگدانەوەو پاڵەپەستۆی نیازە.. نیازیش پەیوەندی بە ڕەوشتی کارگەرەکەوە هەیە.. ئەگەر کارگەر نیازپاك و ڕەوشت پاك بوو کارەکەی بەرزو پیرۆز و بەکەڵکە.. خۆ ئەگەر ڕەوشت پەست و نیازپیس بوو کارەکەی تام و ڕەنگی کارگەرەکە ئەدا.. لەبەرئەوە تێڕوانین و تام و ڕەنگی ڕەوشت لە هەر بیروباوەڕێکدا جیایە لەوی تر.. فرۆید وەکو

جوولەکەیەك و ماددیەکی ڕووتی چاوچنۆك بیر لە ڕەوشت ئەکاتەوە جیاواز لە ئیسلام (بەنامەی خوایی).

یەکەم بۆ هەڵسەنگاندی ڕاکانی فرۆید ئەڵێم:

١. ڕەوشت بەرزیی و نەریتی ڕەوشتی بەشێکە لە ژیانی مرۆڤ شتێکی سروشتییەو هەرگیز دروستکراو و سەپێنراوی کۆمەڵ و کۆمەڵگا نیە.. وە مەرج نیە کۆمەڵ هەرچیان وت ڕاست و دروست بێ و مەرج نیە هەر ڕەوشت و سنورێکی ڕەوشتی کۆمەڵگا دایناب ڕاست بێ ئەگەر فرۆید بە شێوەیەکی زانستی لە مەسەلەی ڕەوشت بگەیشتایە هەرگیز نەیئەوت ڕەوشت دروستکراوی دەستی کۆمەڵگایە.. ڕەوشت ڕەگی لە ناخی دەروون و سروشتی مرۆڤدا چەقاندووە.. نەك تەنیا مرۆڤ بەڵکو هەندێ ئاژەڵ و گیانەوەری تر..

بەهەشت گیان ئەوە بۆچی بە فرۆید ناڵێی:

أ. ئایا یاسای کام کۆمەڵە زۆر ئەکات لە (فیل) کاتێ تووشی نەخۆشی ئەبێ دوور بکەوێتەوە لە گەلە فیلەکەی.. هەتا یان چاك ئەبێتەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش تووشی ئەو نەخۆشیە نەین..؟؟

ب. کام هێزی کۆمەڵگا زۆر ئەکات لە کۆتر کاتێ تاکی جووتەیەك ئەمرێ بەشێوەیەك بۆی دڵتەنگ ئەبێ و پرسەی بۆ ئەگرێ..

زۆرجار واز لە خواردن و خواردنەوە دێنێ هەتا ئەمیش ئەمرێ و ژیان بەجێ ئەهێڵێ..؟؟

ج. کام نەریتی کۆمەڵایەتی بە ئەسپی ڕاگەیاندووە کە هەرگیز ناپەڕێ لە ماینە دایکەکەی خۆی و چەندە دوور لە ماین بێ..؟[199]

د. کام کۆتی ئایینی بووە مێردەزمەی وشتر، هەتا یەکێك دیاربێ ناچێتە لای مێیینەکەی، خۆ ئەگەر لەو کاتەدا یەکێك چوو بەسەریاندا سەریان دا ئەخەن و تەریق ئەبنەوە..

لە کام یاسای ئایین یان بۆرژوازی یان سۆشیالیستی فێری عەیبە عەیبە بون[200]..؟

٢. ڕەوشت داردەستی کۆمەڵێك بۆ کۆمەڵێك یان چەکوشی چینێك نیە بەسەر چینێکەوە.. بەڵکو ڕەوشت و هەستی ڕەوشتی یادخەرەوەو پەلکێشی مرۆڤە بۆ چەند مەبەست و ئامانج و هیوایەکە بەرزو بە مەردم ئەڵێ (بەتەنیا ناژیت بەڵکو تۆ پارچەیەکیت لەم بونەوەرەو ئەوانەی لەم لاو لەولات ئەژین پارچەیەکن لە تۆو هەر یەکە هاوبەشی ئەویترە لە خۆشی و ناخۆشیدا..).

---

[199]- الأنسان بين المادية والاسلام، ص٢٨٨.

[200]- ڕێکەوت لە تەرازووی ژێریدا، ل٧٧.

٣. ڕەوشت پێمان ئەڵێ (کە شەهوەت و ئارەزوو (هۆ)یە بۆ ئامانجێکی بەرزو پیرۆز، بۆ مانەوەی نەوەی ئادەمیزادان، بۆ پەیدا بون و هێشتنەوەی خێزان و پتەوکردنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ڕەوشت بەرزی مانای خەفەکردن و کوێتێتی نابەخشێ بەڵکو کاری ڕەوشت دەست گرۆیی و ڕێنموونی مەسەلە جنسییەکەیە بۆ ڕێگەی ڕاست و پەرگری نەکردن (تطرف) بە هیچ لاییەکداو دانانی ڕێگەیەکی مام ناوەندییە لەنێوان خەفەکردن و بەرەڵاییدا.. بۆ ئەوەی یاسایەك داڕێژێ و پەلی خەڵکی بگرێ بۆ ئەو ڕاستە ڕێگایە.

٤. ڕەوشت بەرزی، ڕاستە ڕێگای بنەڕەتی و مرۆڤایەتییەو، هەر کردەوەیەکی دژی ڕەوشت پەیدا ببێ لە ژیانی مرۆڤدا لاوەکی و زۆڵەکە، خوای گەورە لە فەرموودەیەکی (الحدیث القدسی)دا ئەفەرمێ: (..وإني خلقت عبادي حنفاء كلهم فأتتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم..)[٢٠١]

واتە: من هەموو بەندەکانم بەپاکی و ڕاستڕەوی، دروست کردووە بەڵام شەیتان و ئەهریمەنەکان هاتنە لایان و لەخشتەیان بردن و لە ڕێبازی ڕاستەقینەی ئایین و ڕێبازە خواییەکەیان دەریان کردن.. کەواتە ڕەوشت بەرزی بناغەو ڕێبازی ڕاستەقینەی

[٢٠١]- افكار الاسلامية، ص١١-١٢.

مرۆڤایەتییە و بەد ڕەوشتی زۆڵەکە لە ژیان و مێژووی مرۆڤایەتی دا.

٥. ئەگەر ڕەوشت دار دەستی کۆمەڵگاو دروست کراوی کۆمەڵگایەو کەس ناتوانێ سەرپێچی بکات و هەرچی کۆمەڵگا وتی ئەوە ڕاست و دروستە.. ئایا ئەو کاتە محمد ﷺ خوا کردی بە پێغەمبەر و ناردیە سەر کۆمەڵگای مەککە ئەگەر پرسی بکردایە بە خەڵکی و بە شێوەی هەڵبژاردن و ڕاوێژی ئەو کۆمەڵگا داوای خواپەرستی لێبکردنایەو بیوتایە (کێ خوا ئەپەرستێ و کێ بت ئەپەرستێ..؟) ئایا یاسای ڕەوشتی ئەو کۆمەڵگا ڕایان بۆ کامیان ئەدا.. بۆ خوا.. یان بۆ بت..؟ دیارییە بۆ (بت) چونکە بت پەرستی سەرچاوەی هەموو هەڵسوکەوت و ڕەنگدانەوەی هەموو یاساو باوێکی ڕەوشتی ئەو کۆمەڵگایە بوو.

٦. بەهەشت گیان لەبیرتە لە سەرەتای ئەم باسەمانداو . سەرباسی ئایین لە ڕوانگەی فرۆیدەوە ـ وتمان چیرۆکە ئەندێشەییەکەی فرۆید . خۆی ـ ئەیسەلمێنێ کە هەستی ڕەوشتی و بەندوباوی ڕەوشت بەشێکە لە هەستەکان و غەریزەو سروشتی مرۆڤ خۆییەو هەرگیز لاوەکی و زۆڵەك نیە، وە ئەوە بوو وتمان . بە خەیاڵی فرۆید ـ کاتێ کوڕەکان باوکیان کوشت بەشێوەیەك هەستیان بە پەشیمانی کرد.. گەیشتە سنووری

پەرستن و دیاردەی پەرستن دروست بوو.. بەڵام کاتێ کە کەڵەگاکانی لای داروین کەڵەگا پیرەکە ئەکوژن هیچ هەست بە پەشێمانی ناکەن.. ئەو هەستە شتێکی سروشتییەو زۆر بەرزەو دەستی هیچ کۆمەڵگاو زۆردارێکی ناگاتێ..

**بەهەشت:** کاکە گیان ئەی سنوورو گوێدانی ئیسلام لە بارەی ڕەوشتەوە چییە..؟

**نەوڕەسی:** خوشکێ گیان، ئیسلام مامناوەندییەتی خۆی دەست نیشان ئەکات لە هەموو شتێکداو هەموو پەرگرێك . متطرف . سەرزەنشت ئەکات..

١. لەبارەی پەڕۆشی ئیسلام بۆ ڕەوشت هیچ ناڵێم جگە لە فەرموودەیەکی، لاڵە خوازەکەی ڕۆژی ڕەستاخێزمان ﷺ ئەفەرمێ: ( إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق )

واتە: من بۆیە نێرراوم بۆ ئەوەی لایەنە باشەکان و ناتەواوییەکانی ڕەوشت تەوا بکەم..

قەڵای ڕەوشتی مرۆڤایەتی بگەیەنمە ئەنجام.. جا بۆیە هەرکەس نەیەوێ لەژێر ئەو قەڵا بەرزەو ئەو ڕەوشتە خاوێنانەدا بژی سەر لێشێواو و دڵەڕاوکیەتی لە ژیاندا.. لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنە تەکنۆلۆجی و خۆشگوزەرانییەدا، تروسکایی لە

دڵەکانـدا نیـە و هـیچ کـەس نیـە چەوسـاوە نـەبێ.. تەنانـەت ئیمپریالیزمەکانی ئێمە خۆیان چەوسارەن و هتد[٢٠٢]..

بەهەشـت: کاکە گیـان ئـەوی ئێمـەی موسـڵمان شـانازی پێـوە ئەکـەین ئەوەیـە پێغەمبەرکـەمان پۆپـەی ڕەوشـت بـەرزی بـووە تەنانـەت بە شـایەتی و گـەواهی هـەزاران ئـەورووپی و بێگانـە بـە ئیسـلامی وەکـو (برناردشـۆ، دانتـی و، کـێ و کـێ..هتـد..) گـەورەترین بڕوانامـەی پێغەمبـەریش بـۆ ئـەم مەبەسـتە شـایەتی خوایە کە ئەفەرموێ ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾ القلم

چـۆن ئـەڵێی پێغەمبـەر لەسـەر بنچـینەی ڕەوشـتی ئەوانـەوە (پێغەمبـەرانی پێشـوو) ڕۆیشـتووە..؟ ئەمـە لەلایـەك لەلایـەکی ترەوە هەر هەموو پێغەمبەران خاوەنی بەرزترین پلەی ڕەوشتی و خووی بەرز بون.. چۆن پێغەمبەر هاتووە بۆ تـەواو کردنـی، ئەمـە مانای کەلێن ئەبەخشێ لە ڕەوشتی ئەواندا..؟؟!!

نەوڕەسی: خوشکێ گیان.. پێغەمبەران ( درودی خوایان لەسەر بـێ ) هـەموویان هـاوەڵی یـەك قوتابخانـەن و یـەك وانـەی خواپەرستی ئەڵێنـەوە هـەر یەکـەیان ئەڵقەی زنجیرەیـەکی دوورو درێـژی مێـژووی مرۆڤایـەتین بـەڵام هـەر ئایینـەی خـاوەنی جـۆرە ڕەوشتێك بووە بۆ سـەردەم و کـاتێکی تایبـەتی بـەکاری هێنـاوەو

---

[٢٠٢]- الأسلام والجنس/ ص١٢-١٣.

لەنێوان ماددییەت و میسالییەتدا هەر جارەی بە لایەکدا لاسەنگ بووە.. بۆ نموونە ڕەوشتە بەرزەکانی عیسا پێغەمبەر ڕەوشتێکی میسالی ڕوونن لە کۆمەڵگایەکی میسالیدا نەبێ و بۆ چەند کەسێکی تایبەتی نەبێ ناچەسپێن..

**بەهەشت:** وەکو..؟

**نەوڕەسی:** وەکو ئەوەی کە ئەفەرمێ (ئەگەر کەسێ زللەیەکی دا لەلای ڕاست . جگە لەوەی سەرزەنشتی نەکەی ـ لای چەپیشی تێکە با زللەیەکی تریش لەو بدا..)هەزارانی تر لەم بابەتە بەڵام ئەمە ڕەوشتێکی واقیعی نیەو هەموو کەس لە یەك پلەی ڕەوشتدا نیە.. کاتێ زللەی دا لە لای ڕاستت و تۆ لای چەپت تێ کرد شەرمەزاری بیگرێ و تەریق بێتەوە، هەندێ کەس ئەگەر ڕێزیان لێ بگریت ئەیانکرێت و ئەوان زیاتر ڕێزت لێ ئەگرن بەڵام هەندێ کەس کە خاوەنی دەروونێکی نەخۆشن ئەگەر ڕێزیان لێ بگرت یاخی ئەبن و سواری ملت ئەبن و بەسووکی سەیرت ئەکەن شاعیرە عەرەبەکە ئەڵێ (فإن أنت أكرمت الكريم ملكته× وإن أنت أكرمت اللئيم تمردا) ئیسلام لەبەرابەر هەر تاوانێك و دەست درێژی کردنێك سزایەکی داناوە.. بەڵام لێبووردنیشی داناوەو ئەندامەکانی هان ئەدا بۆ لێبووردن لە هەڵەی یەکتری.. جا ئەگەر بە لێبوردن چاك نەبوو ئەو کاتە ئێمەیش ئەڵێین:

{أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ } المائدة:٤٥

**٢. ئەگەر سەیری فەرموودەکەی پێشەوا ﷺ بکەین کە ئەفەرمێ: (هاتووم و بووم بە پێغەمبەر بۆ تەواو کردنی قەڵای ڕەوشت) مانای ددان نان و بەجوان زانینی هەر کردەوەیەك و ڕەوشتێکی چاکە تەنانەت با لە بت پەرستەکانیشەوە بێ ئەوەتە قورئانی پیرۆز ئەفەرمێ:** {لَّا خَيْرَ فِى كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ } النساء:١١٣.

**واتە: ئەو هەموو چپە چپ و فرە ڕێسییەی خەڵکی . بت پەرستەکان ـ ئەیکەن بێ خێرو هیچە، تەنیا ئەوە نەبێ بۆ یارمەتی هەژاران و ستەملێکراوان و بۆ چاکەکردن و یەك خستنی خەڵکی، ئەیکەن.. واتە ئەم کارو ڕەوشتە چاکانە هەر کەس بیکات چاکە[٢٠٣].**

**٣. ئیسلام هەر لە سەرەتای منالییەوە تۆوی ڕەوشت بەرزی و خووی بەرز لە دەروونی ئەندامەکانیدا ئەچێنێ و هەڵسوکەوتی موسڵمان بەرەو شتێکی چاك پێوەن و چاك ئەکات بۆ ئەوەی کاتێ گەورە بوو، بووە بەردێکی دیواری کۆمەڵ خۆگرتنەوە لە**

[٢٠٣]- افكار الاسلامية: ص١٨-١٩.

کاری خراپ و یاسای ڕەوشتە بەرزەکان بە مێردەزمە سەیر نەکات و لەگەڵی ڕام بێ[٢٠٤].

٤. بۆ چەسپاندنی یاساکانی ڕەوشت ئیسلام پەنا ناباتە بەر خەفەکردنی ئارەزووی تاکەکانی و غەریزە سەرکوت ناکات.. بەڵکو بەپێچەوانەوە - وەکو لەپێشەوە باسمان کرد - ئارەزوو گەشەدار ئەکات و تاسەی ئەشکێنێ بەڵام سنووری دیاری کراوی بۆ دا ئەنێ و ڕێی و جێی بۆ دائەنێ.

٥. ئیسلام ددان ئەنێ بە گرانی و ئازار و ئەشکەنجەی خۆگرتن و ملکەچی بۆ یاساکانی ڕەوشت.. بەڵام خۆگرتن و ڕام هێنانی دەروونی (ضبط النفس) وەکو وەرزش وایە.. لە سەرەتاوە گران و بارە بەڵام لەدواییدا کە ڕاهات شتێکی نەك تەنیا ئاساییە بەڵکو بێ ئەو وەرزشە باری لەشی گرانە و ژیان بێ تامە.

٦. ئیسلام بەشێوەیەك شوێنکەوتووەکانی پەروەردە ئەکات لەسەر ڕەوشت بەرزی، زۆر ئاسانی ئامادەن بۆ لەخۆبوردن لەپێناوی چەسپاندنی یاساکانی ڕەوشت و پارێزگاری سنووری ڕەوشت بەرزیدا..

---

[٢٠٤]– الأنسان بين المادية والاسلام، ص١٠٨.

بۆ نموونە:

أ. یەکێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و خوای گەورە لەوانیش ڕازی بێ کە ناوی (ماعز) بوو.. دڵی چوو بوو لە ئافرەتێك و تووشی شەڕواڵ پیسی بوو بوو.. بەهۆی ئەوەی کە (ماعز) خێزانی بوو دەست درێژی کردبووە سەر ئافرەتەکە ئەبووایە بەرد باران بکرایە هەتا ئەمرد.. هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی سەروەر من زینام کردووەو ئەمەوێ بەرد بارانم بکەن.. (مەسەلەکە خۆی بەچوار شاهد ئەچەسپێ لەبەرئەوەی شایەتی لەسەر نەبوو پێغەمبەر ﷺ ئەیویست شتەکە خەفە بکات و بیداتە دەستی ڕەحمی خوا لەگەڵ ئەو بەندە گوناهبارەی خۆیداو نەیکوژێت..

فەرمووی: نا.. شەڕواڵ پیسیت نەکردووە... ڕەنگە ماچت کردبێت یان گەمە و گاڵتەت لەگەڵ کردبێ.. بەڵام (ماعز) هەر سوور بوو لەسەر زیناکەو بەتوندی داوای لە پێغەمبەری خوا ئەکرد بۆ ئەوەی بەرد بارانی بکات و تۆڵەی ئەو تاوانە نەباتە گۆڕ.. بەهەرحاڵ پێغەمبەر چاری نەماو (ماعز) خۆی لەناو (مەدینە)دا کردی بەقاو و گاڵە.. پێغەمبەر بە ناچاری بەرد بارانی کردو شەهید بوو.. شەهید بوو لەڕێگای ڕەوشت بەرزیدا.. هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بووە بگرەو بەردەیان لەسەر (ماعز)

هەندێکیان ئەیانووت بەڵکو خوا لێی ببوێت و هەر یەکەیان شتێکی ئەووت، یەك دوو ڕۆژێ بەو شێوەیە بون.. هەتا قسەکە گەیشتەوە پێغەمبەری خوا و ڕووی کردە هاوەڵەکانی و فەرمووی.. داوای لێبوردن بکەن بۆ (ماعز) بەڕاستی تۆبەیەکی کردووە ئەگەر بەش بکرێت بەسەر ئومەتێکدا بەشی هەموویان ئەکات[205]..

ب. نامەوێ لێزمەی بڕژێنم بەسەرتا چونکە ئیسلام و مێژووی ئیسلام ئەوەندە بەو ڕەوشتە بەرزانەو بەو ڕەوشتە بەرزانە ئاخنراوە خەریکە پێی ئەڵێن (ئایدیالی).. هەتا ئێستایش لەم کوردستانەی خۆماندا کاتێ ئەڕۆنە بەردەم شەرع و بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناو خۆیان ئەوەندە بە گیانێکی لێبووردن و ڕەوشت بەرزییەوە ئەڕۆن مادییەکان کاس و گێژ ئەکەن..

٧. بەهەشت گیان.. ئەگەر سەیری لاپەڕەکانی مێژوو بکەین بە دەیان دەوڵەت و بە دەیان شارستانی و نەتەوەو دەسەڵاتداران بەدی ئەکەین کە بەهۆی بێڕەوشتی و بەدخوویی ئەو خەڵکەو دەوڵەتەیان جار جار بەهۆی شەپواڵ پیسی تاقانە کەسێکەوە ئەو دەوڵەت و گەلە یان ئەو شارستانی و هۆزو کۆزە بەسەرو

---

[205]- كتاب الله يا ولدي، ص٤٥-٤٦.

بەرەوە تیاچوون و بونە مشەخۆرەی گەلانی ترو خۆیان و قەوارە دەسەلاتیان فڕێ درایە زبڵدانی مێژوو سەرەلوێنکی گۆشەیەکی ژیانەوە.. نموونە گەلێ گەلێ زۆرە:

١. پێویست ناکات باسی شارستانی و پێشکەوتن و دەسەلاتی دەوڵەتی (ڕۆما)ت بۆ بکەم ئەگەر سەرێکی عەممان و (جرش) لە ئوردن یان ئەستەمبوڵ و (ئەیاسۆفیا و ڕۆمەلی حەسارو) هەزاران شوێنەواری تریان لەزۆر جێگای ئەورووپاو هەندێ لە ولاتە ئیسلامییەکانی سەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست بدەیت مەزنی شارستانی ئەو دەوڵەتەو دەسەلاتداری ئەو ئیمپراتۆریەت بۆ دەرئەکەوێت.. ئەی چی لێهات و بۆچی کەوت..؟!

مامۆستا أبو الاعلى المودودی ئەفەرمێ[٢٠٦]: (.. کاتێ جڵەوی ڕەوشت لە کۆمەڵگای ڕۆماندا شل بوو ئافرەتی سۆزانی و بەرەڵلا بەربونە گیانی کۆمەڵگاکە، شانۆ بەناوبانگەکەی سەراسەری ولات جێگای ڕووت کردنەوەی ئافرەت و نواندنی سنگ و مەمك.. ماڵەکان، هەریەکەیان بونە پێشانگای وێنەو پەیکەری ئافرەتی ڕووت، بەشێوەیەك داوێن پیسی و ئافرەتی سۆزانی لە ولاتدا بلاوبوویەوە بەدەگمەن ئافرەتی ماڵ و داوێن پاك دەست بکەوتایە..) مامۆستا مەودودی بەدرێژی باسی بەدڕەوشتی

---

[٢٠٦]- الحجبا، ص٢٣-٢٤.

ڕۆمان و ڕۆچووی گەلی ڕۆمان لە ڕەوشت پەستی ئەکات و تا لە ئەنجامدانی ئەفەرمێ: (ئەمانە بونە هۆی هەرەس هێنان و لنگەو قووچ بونی دەوڵەت و سامان و دەسەڵاتی ڕۆمان)..

٢. لە ئەورووپای کۆن و بێڕەوشتی ئەورووپای کۆنەوە دێین بۆ ئەورووپای تازەو شکاندنێکی تری.. یادێکی شاندێکی هێڵی (مایجنۆ)ی فەرەنسی و خوس دادانی و کەوتنی لەژێر پێڵاوی سەربازانی ئەڵمان ئەم گەردن کەچی و کەوتنەی فەرەنسە لە بەر نەبونی چەك و تەقەمەنی نەبوو.. چونکە فەرەنسەی ئەو کاتە خاوەنی کوشندەترین چەك و جبەخانە و دەسەڵات بوو.. وە هێڵی بەرگری (ماجینۆ) بەهێزترین سنووری بەرگری بوو لەو کاتەدا.. کەچی فەرەنسە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا.. لە ماوەی دوو هەفتەدا چۆکی داداو دەستی تەسلیم بونەوەی بەرز کردەوە.. هۆی سەرەکی تەسلیم بون و چۆك دادنی فەرەنسە هیچ نەبوو جگە لە ترسی ڕووخاندنی سەماگاکان و سۆزانی خانەکان بە بۆردمانی ئەڵمان[٢٠٧]..

[٢٠٧] – جاهلية القرن العشرين، ص١٩٧.

٣. لە ئەوروپاوە دێینەوە بۆ لای عەرەبەکانی خۆمان مەسەلەی فەلەستین و شەڕی نێوان جوولەکەو عەرەب، من هیچ ناڵێم با گوێ بگرێن لە یەکێك لە ئەفسەرە بەرزەکانی عەرەب و عێراق و ژیاوی هەموو جەنگەکانی عەرەب و فەلەستین هەر لە شەڕی یەکەمی هەتا دوا شەڕی، مامۆستا (محمود شیت خطاب) کە لە کتێبی (طريق النصر في معركة الثأر) باسی ڕاونانی عەرەبەکان ئەکات لە شەڕی حوزەیرانی ١٩٦٧دا و سەرکەوتنی جوولەکە ئەفەرمێ (ئەوی کە چەسپیوە لە دڵمداو بەڕوونی بۆم دەرکەوتووە ئەوەیە، ئەوی جنس پیس بێ و گریفان پیس بێ ناتوانێ وەکو پیاو و مەردانە بجەنگێ).

مەبەستم لە جنس پیسی هەتیوو مەتیوی بەردەم سۆزانیخانەکان و سەر مێزی خواردنەوەو ڕەوشت نزمەکانەو ئەو شەرواڵ پیسانەیە هەر بیریان لای ئافرەتی پاش ماوەی خەڵکی بێ، و شەوان ڕۆژیان لەگەڵ بکەنەوە.. وە مەبەستم لە گیرفان پیسی، ئەو کەسانەیە پارەی حەرام و بەرتیل و چووبێتە باخەڵیانەوە.. ئەوەی سامانی بە ڕێگەی نابەجێ کۆ کردبێتەوە..)[٢٠٨].

---

٢٠٨- الاسلام والجنس، ص٦٦.

٤. لای عەرەبەوە بەرەو کوردستان دێینەوە.. کوردستانی وێران و چەند لاپەڕەیەك لە مێژوومان کە بە دەستی نوسەرانی پێشکەوتووی (!) تازەو بە گەواهی ئەوان و لەژێر تیشکی زانیاری مێژووناس و ڕۆمان نووسی ئەواندا نووسراوە..

أ. خوا بزانێ بە چ چەرمەسەرێ و بەخوێنی چەند هەزارلاوی کورد توانیویانە (میرنشینی ئەردەڵان) پێك بهێنن و خوا خۆی ئەزانێ بە چەند ئارەق ڕێژان و شان داچەکاوانی هەورامی چەمەی (زەڵم) ئاوەدان کرایەوەو کرایە مەڵبەندی ئاڵایەکی کورد... ئەی چی لێهات..؟

گوێ لە کاك حەمە کەریم هەورامی بگرین و نووسینە ڕۆمانە چیرۆکە مێژووییەکەی بخوێنینەوە[٢٠٩] کە کورتەکەی ئەوەیە (خان) احمد خانی کوڕی هەڵۆ خانی بیری ئەردەڵان دڵی ئەچێ لە خوشکێکی پاشای ئێران و شای ئێرانیش بەو مەرجە ئەیداتێ کە باوکی و کار بەدەستانی میرنشینی ئەردەڵان بە دیلی بنێرێ بۆ پاشاو وڵاتەکە بخاتە ژێر چنگ و کاسە لیسی ئەوانەوەو.. پاش ئەوەی ئەو کەوتنە مێژووییەی پێ کردو خاتوو (کلاوزەڕی) هێنا، بەو ژێر چەپۆکەییەش وازی لێ نەهێناو دای بە

[٢٠٩]- خاتوو کلاوزەڕ، ل١١١-١١٧-٢١٤.

گڕی خەڵکدا تا قەرەچۆڵی بڕی و کردیە پەندی مێژوو بۆ بەد ڕەوشتان و ئارەزوو پەرستان.

ب. بەهەشت گیان بڕۆ هۆی ڕوخاندنی میرنشینێکی تری کورد، کاول بونی قەڵا مێژووییەکەی (دمدم) بخوێنەرەوە (کاتێ حەسەن خانی والی هەمەدان بە هەشتا هەزار سوارەوە هێرشیان هێنا بۆ سەریان و ئەوانیش لەو قەڵا سەختەدا خۆیان حەشاردابوو بەرگرییان لە داگیرکەرانی کوردستان ئەکرد شەرواڵ پیس و بەدڕەوشتێکی وەکو (خولەکیهەکانی) لەبەر خاتری ساتێك ڕابواردن لەگەڵ ئاغا ژنەکەیدا (ڤیان) بووە جاش و بووە هۆی کوشتنی نەتەوەکەی و بە تینویەتی خنکاندنی و ناوی دەسەڵاتدارێتی دمدم چوویە کون و قوژبنی مێژووەوە[٢١٠].

٨. زۆر کەس لای وایە پلەی بەرزی زانیاری ئەبێتە هۆی بەرزبونەوەی پلەی ڕەوشت.. بەڵام ڕەوشت بەرزی و دەروون پاکی هیچ پەیوەندی بە ڕێژی بەرزو نزمی پلەی زانیارییەوە نیە.. زۆر جار ئەبینی کابرایەکی لادێی نەخوێندەوار ڕەوشت بەرزترە لە خوێندەوار و ڕۆشنبیرێك... نەك تەنیا لای ئێمە بەڵکو لە ئەوروپاو لای ئەوانیش..

---

[٢١٠]- شەهیدانی قەڵای دمدم/ ل٢٠-٢٧-٤٨.

سەیر ئەکەیت ( ڤان کوخ = Van gogh) وێنەکێش و هونەرمەندی بەناوبانگی هۆڵەندی پاش شێت بونی خۆی خۆی کوشت، یان سەیر ئەکەیت نووسەرێکی بەرزی ئەمریکی وەکو (ئادگار ئالان بوو Edgar Allan poe) ژیانی بە سەرخۆشی و عارەق خۆری و بێئاگا لە خەڵکی بەسەر برد.. وە چیرۆك نووسی بەناوبانگی ڕوس (دۆستوڤیسکی) قومارچییەکی سەرە مڕ بوو.. هەزارانی تر[211].

٩. جیهانی بێ ڕەوشتی جیهانێکی بێتام و بێ مانایە کە ڕەوشت نەما هیچ شتێك نامێنێ.. نە یاسا و نە زانیاری نە پێشکەوتن هیچیان نرخی نیە.. ئەم بێڕەوشتیە پاڵی ناوە بە ئەوروپاوە کە زۆر بێ نرخ سەیری ژیان و ئامانجەکانی ژیان بکەن. هەر لە پەیدابونی فەلسەفەی وجودی و پەیدابونی هەزاران لاوی هەلاتووی ئەرکەکانی ژیان و بێ مەبەست و ئامانج بێ هیواو بەداماوی ئەژین..

بەهەشت گیان لە ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەم دا لە ئەوروپا بزوتنەوەیەکی هونەری پەیدا بوو پێیان ئەوتن (دادای Dadism) ئەم کۆڕو هونەرمەندانە (!) کاریان سووك کردنی ژیان و تڕۆکردنی ڕەوشت و قیزەون کردنی هەموو خووخدەیەکی

---

[211] – اصول علم النفس وتطبيقاته، ص٥٩.

مرۆڤایەتی بوو.. تابلۆ هونەرییەکانیان لە ئاودەستخانە پیشان ئەدا[٢١٢]. ئیتر بەدوای ئەواندا هەزاران کۆڕ و کۆمەڵ و فەلسەفەو قوتابخانەی هونەری و ئەدەبی دروست بون بۆ ناشرین کردنی دیمەن و ڕێبازی ژیان ڕەش کردنی ڕووی ڕەوشت و لیخن کردنی لای خەڵکی.

١٠. لەسەراسەری مێژوودا جوولەکەو ڕەوشت بەرابەری یەکتری ڕاوەستاون و هەر هەموو دژانی ڕەوشت (و لە هەموو چەرخێکدا) جوولەکەو کۆمەڵانی جوولەکە بون..

هەر تاوە نە تاوەیەك فوو ئەکەنە جوولەکەیەك و زلەی ئەکەن و ئەیکەنە پاچی پووخاندنی قەڵای ڕەوشت.. هیگل پووخا دورکایم، دورکاین لاواز بوو فرۆید.. فرۆید کەوت جوولەکەیەکی ترو زڕناو دام و دەزگای جوولەکە لەسەراسەری جیهان زل زلەی ئەکەن و بە هەزاران لاوی کچ و کوڕی ئەخەنە ژێر دەست، بۆ نموونە لە سالانی پەنجاکاندا کە خەریك بوو فرۆیدی سەرەو خوار بێتەوە ترسی ڕاست بونەوەی قەڵای ڕەوشتیان هەبوو جوولەکەیەك پەیدا بوو بەناوی ـ هەربێرت مارکۆز. ئەم (مارکۆز)ە سەیر بوو هەڵسا بە بێنەو پەڕۆیەك لەنێوان هیگلی و مارکسی و فرۆیدیدا بۆ لەناوبردنی ڕەوشت..

---

[٢١٢]- فەلسەفەی جوانی و هونەر، ئیستاتیکا، ل٢٠٦-٢٠٧.

هەرچی هەتیوێکی بێڕەوشت و ڕووخاو لە ژیانداو ئاشوبچی و چەقاوەسوو نەبووایە دوای نەئەکەوت..

خەڵکی بانگ ئەکرد بۆ ڕووخاندنی هەموو شتێك.. نەریت.. ڕەوشت.. ئایین.. یاسا.. کۆمەڵ.. خێزان.. بە هەزاران لاوی سەرلێشێواوی ئەوروپی و ئەمەریکی کەوتنە شوێنی، وازیان لە خێزان و کارو کۆمەڵ هێنا.. لەسەر شۆستەکان و ڕێگاکان ئەخەوتن.. پێ پەتی و جل و بەرگی شڕو وڕ.. خۆیان ڕائەهێنا بۆ ژیان لەناو پیسایی و زۆنگاو زەلکاودا.. کاریان تەنیا تلیاك کێشان و هێروین کێشان بوو.. لە سەرە ڕێگاو بە چاوی هەموی خەڵکی سواری یەکتری ئەبون.. کاری جنسی هەمە جۆر.. نێر لەگەڵ مێ.. نێر لەگەڵ نێر.. مێ لەگەڵ مێ.. بە سواڵکەری و دزێتی ئەژیان.. بەناوی لەناوبردنی نەریتی بۆرژوازی و هەڵوەشاندنی ڕەوشتی بورژوازی.. هەتا گەیشتە ساڵی شەستەکان و خەریك بوو خەڵکی بیری بکەنەوەو لە پیلان و چاو و ڕاوی جوولەکەو شێتێ واز بهێنن.. کەچی هەر ساڵی ١٩٦٨دا جوولەکەیەکی تریان لە فەرەنسەوە خستەگەڕ بەناوی (کۆهین پالدیپ) بۆ ڕوخاندن و کاول کردنی قەڵای ڕەوشت و بنەبڕ کردنی هەموو یاسا و ڕژێم و خوویەکی مرۆڤانە[٢١٢].

[٢١٢]- مجلة آفاق عربية، العدد١، السنة٧، ايلول ١٩٨١، ص٧١-٧٢.

١١. با بگەڕێینەوە بۆ وتە نابەجێیەکەی فرۆید کە هەموو کۆسپ و ناخۆشییەکی ژیان ئەداتە دەست خەفەکردنی جنسی و لای وایە کاتێ مرۆڤ لە کۆتەکانی ڕەوشت ڕزگاری بوو ئیتر بەختیارترین و دڵنیاترین مرۆڤە.. من هیچ ناڵێم.. بەڵام بەهەشت توبی و خوا پرسیار لەوان و لە پێشکەوتووەکانی لای خۆمان بکەو بزانە بۆچی خۆ کوشتن و خۆ خنکاندن بۆتە مۆدێلی سەراسەری ئەوروپا.. هەتا پێشکەوتووتر و زیاتر سەربەست بێ (!) پاڵێوراوە ترە بۆ خۆکوشتن.. بزانین ئەمانە بۆچی خۆیان کوشت؟!.

ا. ئەکتەری بەناوبانگی جیهانی و خەڵکی ئەمەریکا (جیج یۆنگ) خێزانە خۆشەویستەکەی خۆی کوشت و دواجار خۆیشی کردە قوربانی گوللەیەك.

ب. ئەکتەرو ئەستێرە گەشەکەی سینەمای فەرەنسی (!) . شارل پواییە. بۆی خۆی خۆی کوشت . ژنەی خۆی خۆی کوشت.. کوڕەکەیشی ئوجاخی باوك و دایکی ڕۆشن کردەوە ئەویش هەر خۆی خۆی کوشت؟

ج. (مالێن مۆنرۆ)ی بەناوبانگ بە حەبی خەو خۆی کوشت.

د. (سۆزان هێوارد) بە عارەق خۆی تەقاند.

هـ. (ئالان دیلۆن) کە ویردی سەر زمانی زۆر لە کچانی لای خۆمانە بە بەنگ و تلیاك و هێرۆین خۆی خۆی کوشت.

و. (ئاژاجاردنر) شێتی عارەق و (مارلێن دیترج) شێتی درێتی و (کرتیاگاریۆ) شێتی خۆشاردنەوەو دەیان و سەدان هونەرمەندو ئەکتەر خۆیان کوشت و شێت بون.

بەهەشت گیان ئەمانە لە پۆپەی پێشکەوتندا دوور لە هەموو کۆت و پێوەندێکی (!) ئایین و ڕەوشت ئەژین.. ئەوی کە ئێمە ناومان نەبیستبێ لە دیکوری ژیان و هۆی خۆشگوزەرانی هەیان بوو.. ئەی بۆچی خۆیان کوشتووە؟..

کێ هەیە لە سەدەی بیستدا ژیابێ و هەندێکی کەمیشی ئاگای لە سینەماو جیهانی هونەرو ئەکتەر هەبێ و ناوی (مارلین مۆترۆ)ی نەبیستبێ.. خۆی کوشت.. پاش خۆی لە بانقی (مانهاتهن)ی نیۆیۆرك لەناو سنووقی شت ومەك و پارەکەیدا وەسیەتنامەیەکی نوسیبوو کە تێیدا بە هەموو ئافرەتان ئەڵێ.. (خۆت بپارێزە لە ناوبانگ دەرکردن.. خۆت بپارێزە لەوانەی ئەیانەوێ گڵۆپی ڕەنگاو ڕەنگ چڕکەنە سەرت.. من چارە ڕەشترین ئافرەت بووم) لەم سەرزەوییەدا.. چونکە نەمتوانی ببمە دایك.. ئای چەندم پێ خۆش بوو لەبری ئەم هەموو ناو و شۆرەتە جیهانییە ئافرەتی ماڵ بوومایە لە خێزانێکی پاك داوێندا.. بەڕاستی ژیانی خێزانی

نیشانەو هێمای بەختیاری و کامەرانی ئافرەتە بەڵکو نیشانەی کامەرانی مرۆڤایەتییە.. بەڕاستی خەڵك زۆر ستەمیان لێ کردم و بۆم دەرکەوتووە کارگەر لە سینەمادا ئافرەت ئەکاتە کەرەستەی کڕین و فرۆشتن.. بە نرخێکی هەرزان.. بێ نرخ.. چەندە بگاتە پۆپەی ناو و شۆرەت و چەندە ناوی بێ مانای دەرچێت..)[٢١٤].

١٢. کاتێ کە باوەڕ بە خوا نەما.. پەیڕەوی پرۆگرامی ئایین بەسووکی سەیرکرا.. قەڵای ڕەوشت شکێنراو سەروەت و سامانی ڕەوشتی هەزاران ساڵەی ئادەمیزادان بەتاڵان براو بێڕەوشتان چاوچنۆکان تێی شیشان و چڵپاویان کرد، بۆیە سزای خواییان وەکو مامۆستا (..) ئەفەرمێ[٢١٥] سزای سروشتی مرۆڤایەتی(عقوبة الفطرة) ڕژایە سەر زەوی دڵنیایی لە هیچ جێگایەك نەما.. کام نەتەوەی زۆر بچووکە بە دەیان کۆڕ و کۆمەڵ و پارت پارتێنەی بۆ یەکتری کوشتن تێدا دروست بوو.. لەنێوان دەوڵەتەکاندا شەڕو شۆڕو کوشتن و بڕین بە ملیۆنان ون بوو قاچ قرتاو شان شکاو و چاو دەرتۆقیو، کێشە بە کێشە ئەڵێ ڕێگام بکە.. بەرهەمی وڵات کەم ئەبێ کێشە دروست ئەبێ، زۆر بێ هەر کێشە دروست ئەبێ.. بازرگانی گورج و گۆڵ بێ هەر کێشەیە،

---

[٢١٤] - الأسلام والجنس، ص٧٠-٧١.

[٢١٥] - الأسلام ومشكلات الحضارة، ص١١٨-١٤٠.

سست و پەست بێ هەر کێشەیە، دانیشتوانی ولاَت زۆر بن، کێشەیە، کەم بن هەر کێشەیە.. ئەم خەڵکە دڵی تەقی و سوێی بوویەوە.. کێشەیەك چارەسەر ناکات هەزاران کێشە دێتە جێگاکەی هەروەها تا دواجار خوا خۆی ئەزانێ چی و چ بەلاَیەك بەر ئەبێتە پۆتەلاَکی مرۆڤایەتی .

**دوا وشەمان :**

**بەهەشت:** خوای گەورە پاداشتی گەورەت بداتەوە کاکە گیان بۆ ئەم لێکۆڵینەوە و باشە خۆشەی بۆت کردم هەرچەند کاتێکی زۆرم لێ گرتیت و ماندووم کردیت.. بەڵام بەڕاستی زۆر کەڵکم لێ وەرگرت و نەخشەو پلانە گڵاوەکانی زایۆنی و دێوڵە جوولەکانم بۆ ڕۆشن بوویەوە.. جا لێرە کە ئەم باسە کۆتایی پێ ئەهێنین و ڕەنگە بەهۆی خوێندنیشەوە لە یەکتری دوور بکەوینەوە دووا وشەو ئامۆژگاریت چییە هەتا وەکو گوارە بیکەمە گوێم و هەرگیز لەیادم نەچێت..؟

**نەوڕەسی:** خوشکە خۆشەویستەکەم.. دووا وتەم بۆت ئەوەیە دیوار لەگەڵ تۆمەو پاسار گوێت لێ بێ.........

١. فرۆید زایۆنێکی ڕەگەز پەرستەو چەندە عەبای فش و فۆڵی زانیاری توێژینەوەی دەروونی مرۆڤ بپێچێ لەخۆیەوە هەر هەمووی بەرگی سەربازی زایۆنیەو بۆ کارگوزاری ئەوانە، یەکێك بوو لە دۆستە هەرە نزیکەکانی (هەرتزل) ی دامەزرێنەری زایۆنی جیهانی[٢١٦]... ئەگینا زانای ڕاستەقینەی دەروونناسی نەبووەو خەڵکی لە ناسینی دەروونی مرۆڤ چەواشە کردووە..

---

[٢١٦]– علی الفكر الاسلامی ان یتحرر من سارتر و فروید و دورکایم، ص٦، ونظریة فروید، دراسة وتحلیل، ص٧.

ئەوەتا (پاڤلۆپ) زانای بەرزی دەروونناسی ڕووسی ئەڵێ[217] ، هەرچی بیر لە فرۆید ئەکەمەوە و بەراوردی ئەکەم لەگەڵ زانا فەسیۆلۆجیەکانداو لەگەڵ ئێمەی زانادا، دوو کۆمەڵ خەڵکم دێتە بەرچاو، کە لە لاپاڵی کێوێکی سەخت و بەرزدان و ئەیانەوێ کونی بکەن و ـ تونێل ـ ێك لێدەن.. بۆ ئەوەی بگەنە ڕووناکی ـ مەبەستم زانین و تێگەیشتنیانە لە ژێری مرۆڤ ـ بەڵام فرۆید بەرەو خوارو بۆ قوڵایی شاخەکە هەڵیئەکەندو هەتا نەگەیشتە ئامانج و خۆی و بیروڕاکانی گۆڕ کردو کەوتنە پێچ و پەناوی ئەو دیوی هەستەوە.. بەڵام ئێمە ڕێگای بەرەو ڕووناکیمان گرتۆتە بەرو ـ بەقسەی خۆی ـ ڕۆژێ لە ڕۆژان پرۆژەکەمان ئەگاتە ئەنجام و ئەگەینە ڕووناکی و هەوای پاك ).

٢. فرۆید خۆی باوەڕی بە تیۆرییەکانی خۆی نەبووەو ئەڵێ ( ڕەنگە هەندێ کەس لێم بپرسن تا چ ڕادەیەك من دڵنیام لە تیۆرەکانی خۆم و چەندە قەناعەتم پێیان هەیە.. وەڵامی من بۆیان ئەوەیە بەڕاستی من خۆم قەناعەتم پێیان نیەو داوایش لە کەس ناکەم باوەڕیان پێ بهێنن..)[218].

---

[217] – پاڤلۆڤ و فروید، ج١، ص٣.

[218] – الجنس وآثاره في السلوك الأنساني، ص١٤٨.

٣. د.أحمد عزت راجح مامۆستای دەروونناسی لە زانکۆی ئەسکەندەرییەی میسر لە کتێبی (أصول علم النفس)دا ئەڵێ[٢١٩] (فرۆید لەم ڕۆژانەی دوایی ژیانیدا وتوویەتی من سەر بە قوتابخانەی فرۆید . واتە خۆی ـ نیم) ئەمە مانای ددان نانە بە هەڵەکانیداو یەخە هەڵتەکاندنە لە تیۆریەکانی.. کاتێ ئەو خۆی حاشای لێ بکات بۆچی ئەبێ خەڵکێکی تر داکۆکی لەسەر بکەن..؟؟!

٤. گۆڤاری . الدستور ـ ی ئینگلیزی کە بە زمانی عەرەبی دەرئەچێ لە گۆشەی (حکایات و حکایات)داو بە ناونیشانی (فروید کان مریضا نفسیا) نوسیبووی[٢٢٠]:(مێژوونووسێکی ئەمریکی بەناوی . چێڤ ماسۆن ـ سەلماندوویەتی کە زانای دەروونناسی بەناوبانگ فرۆید نەخۆش بووەو خۆیشی پێویستی بە پزیشکێکی دەروونی بووە.. ماسۆن، ئەڵێ بەهۆی هەندێ لەو یاداشتە تایبەتیەی فرۆید بەجێی هێشتوون لای (ئان)ی کچی دەستم کەوتووە زۆر کاری گەنەڵە پیسی فرۆیدم بۆ دەرکەوتووە..) ماسۆن هەندێ لە دەخەڵی فرۆید باس ئەکات.

---

[٢١٩] – نظرية فرويد، دراسة وتحليل، ص٣٢.

[٢٢٠] – مجلة الدستور، العدد٢٦٥ لندن، ص٧٦.

٥. سەیرکردنی مرۆڤ و هەڵسوکەوتی مرۆڤ بە تەنیاو جیاکردنەوەی لەم بونەوەرە و دروستکەری بونەوەر سەیرکردنێکی چەواشەیەو مرۆڤ لە توێژەر ون ئەکا مرۆڤ گەردێکی بێ لانە نیەو بێ خاوەن نیە.. بەڵکو پێویستە ئەو کەسەی ئەیەوێ لە ناوەڕۆکی توێ توێی مرۆڤ بگات وەکو پارچەیەکی ئەم بونەوەرە گەورەیە سەیری بکات[٢٢١]..

٦. ئەو کۆمەڵگا ئاژەڵییەی فرۆید داوای ئەکات نەك بە کەڵکی ئێمەی موسڵمان نایە تەنانەت بە کەڵکی هیچ مرۆڤێك نایە.. کۆمەڵگایەك لە بەرزترین پیاوانی وڵات تا دوا کەسیان لە پۆپەی بێڕەوشتیدا ئەژین ؛ یەکێك لە دانیشتنەکانی کۆنگرسی ئەمریکی دوا کەوت.. بۆچی؟.. چونکە لە باڵەخانەیەکی بەرابەر یانەی کۆنگرس ئافرەتێك بەڕووت و قووتی . هەر تەواو ڕووت ـ وەستابوو، ئەندامە . بەڕێزەـ کانی کۆنگرس هەر سەیری ئافرەتەکەیان ئەکردو هیچیان پێ نەکرا..

هەتا سەرۆکی مەجلیس پیاوێکی ناردە لای ئافرەتەکەو تکای لێ کرد یان خۆی پۆشتە بکات یان بڕواتە ژوور بۆ ئەوەی کۆنگریسی ئەمریکی سەیرێکی کاروباری ڕامیاری جیهان بکات!! کاروباری ڕامیاری جیهان[٢٢٢]..!

---

[٢٢١] – خصائص التصور الاسلامي ومقوماته، ص٢٥.

[٢٢٢] – الانسان بين المادية والاسلام، ص١٧٨-١٧٩.

٧. بەهۆی چڵکاوخۆری هەندێ لە لاوەکانمان بۆ داگیرکەرانی فیکریمان و قوتابێتی فرۆید خەریکە ئەو سەر لێشێواوییە توانەوەی کەسایەتی و ئەو ژیانە بەرەڵلایەی ئەوروپا وڵاتەکەمان داگیر بکات.. ئەگەر سەیری ژیانی هەندێ لەو لاوانە و گەنجە گۆشکراوانەی ئەوروپا بکەیت..

سەیر ئەکەیت تووشی دڵەڕاوکە و ژیانێکی ئاڵۆزاوی بون.. دوور لە واقیعی کۆمەڵەکەی خۆیان ئەژین هەر بە لاشە لە سلێمانی و کوردستان و عێراق ئەژین.. ئەگینا بە خەیاڵ پلاوی خۆیان سەرخۆشن و لەبن قولەی (ئیڤل) دا هەڵئەخەنەوە..

لە مەبەستی مانای سەربەستی نەگەیشتوون.. برسێتێکی جنسی هەر تێر نەبوو، دڵ و دەروونی داپێچاون.. زۆربەی ڕۆژانی ژیانیان بە خۆ ڕێك و پێك کردن و رتووش و دیکۆر کردنی دەم و چاو و جل و بەرگ و قژ و پێڵاو بە کوڕ و کچەوە بەسەر ئەبەن..

مۆدێل و مۆدێل کاری.. قسەی زل و قەبەو بێ ناوەڕۆك.. ناواخن کراو بە وشەی ئینگلیزی و فەرەنسی و جار جارە یۆنانیش[٢٢٣]..

٨. بەهەشت گیان وەکو خوا حافیزییەك لە باسەکەمان پێتی ڕائەگەیەنم کە موسڵمانانی ئەمڕۆ ـ موسڵمانە هۆشیارەکان ـ زۆر

---

[٢٢٣]– سەیری کتێبی (اصول علم النفس وتطبيقاته) ل١٤٠–١٤٨ بکە.

گەورەترن و بەهێزترن لەوەی هیچ گورگێك بتوانێ دەمیان بۆ بەرێ و، پاش پرخەی خەوێکی زۆر، چاوم لێیانە خەریکن وردە وردە لە خەو ڕادەپەڕن، دە با ڕاپەڕن، دەبا خۆیان بتەکێنن و هەڵسنەوە..

ئیتر تۆو هەموو موسڵمانێك ئەدەمە دەستی خواو خوا لە مرۆڤە شەیتانۆکەکان بتانپارێزێ و هەزاران سوپاس بۆ خوا.

چنارەی پارەزان

١٤٠٣ك ١٢/٤/١٩٨٣ز

**ماڵئاوایی له تەرازووی ژیری :**

**١. ساڵی ١٩٧٥ بوو . واته دەساڵ لەمەوبەر که یەکەم ئەڵقەی زنجیرەی تەرازووی ژیریی (ڕێکەوت) کەوتە بازاڕەوە کە لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد بوو، بەڵام نەك وەکو کتێبێکی ئاسایی، جگە لەوەی.. هەموو پیتەکانی بوو بووە نەشتەرێك بۆ پەڕەکەی دڵی دوژمنانی بیروباوەڕەکەی..**

**یەکەمین نووسینی زانیاریش بوو لە سەراسەری کوردستاندا بگرە لە سەراسەری مێژووی کوردا کە بەشێوەیەکی زانستی و واقیعی تەقە لە بنی مەنجەڵەکە هەڵسێنێ و بیروباوەڕی لەق و لۆقی ماددە پەرستان و خوانەناسان گێژوخول بدات و هەمانەی پڕ لە فوویان بە نەشتەری زانیاری فش بکاتەوە، بۆیە زۆر لەو ورگانەی فوویان تێچووبوو تەقین و شەقیان بردو گەلێك هێرشی ڕاستەوخۆیی کرایە سەر نوسراوەکە و تەنانەت سەر کۆڕیش، هەر لە (مامەخەمە)ی داماوو خەمباری (بیری تەپیو) ببورن (بیری نوێ)ی ژمارە ٢٦٩ ڕۆژی ١٩٧٦/١٢/٤..**

**دیسان بیری نوێ ژمارە (٢٦) ڕۆژی ١٩٧٧ و بیری نوێ ژمارە (٢٧٣) ڕۆژی ١٩٧٨/٧/١٤ ڕۆژی کوردستان ژمارە ٤٧و ٤٨ ی تەمووزی ١٩٧٧ وە عیراق ژمارە (٣) ڕۆژی ١٩٧٧/٥/٢١ هەتا**

گەلێك داخ لەدڵی تر لە کتێب و نامیلکە، بەڵام ئەنجامەکەی چی بوو؟!

ئەنجامەکەی ئەوەیە زنجیرەی (تەرازووی ژیری) کارگوزاری ئیسلامەو مارەکەری بیروباوەڕە پیرۆزەکەیەتی، ئیتر چۆن بەبێژنگ و هێڵەك بەری ئەگیرێ ؟!

بۆ ئەوەی ئاوە سازگارەکەی قورئان دڵەکان پاراو بکات..

خوا کردی دەیان کانیاوی دڵ و مێشك لە کوردستاندا تەقی و سەدان پێنوس کەوتە کارو کتێب و نامیلکەی وا جوان و قەشەنگ کەوتنە بازاڕەوە (تەرازووی ژیری) هەر ناوی نەماو باسی نەما! (مەلا شارەزووریی) لەناو ناوی دەیان نووسەری سەرکەوتووتردا ون بوو..

من چیم ئەوێ لەوە زیاتر دوژمنی بیروباوەڕەکەم سووك و پەراگەندەو ئاوارە ببێ ؟!

منیش پێنووسەکەم بە تەنیا نەمایەوە بە دەیان هاوڕێ و هاودەنگ و هاوسەری بۆ پەیا بوو (الحمد لله علی کل حال) .

٢. هەندێ لە موسڵمانەکان گلەییان هەبوو لە (تەرازووی ژیری) کە پێزو هەوێنی گیانی کەمە..

ڕاست ئەفەرموون، بەڵام موسڵمانەکان دوورن لەو واقیعەی منی تێدا ئەژیم..

ئەوان لە جیهانێکی پاك و بێگەردی ئیسلامیدا ئەژین، ژیان لەگەڵ تەفسیرو فەرموودەکانی پێغەمبەری پێشەواو تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا بەسەر ئەبەن، بەڵام من چەند کتێبی ئیسلامی و خواپەرستی ئەخوێنمەوە ئەبێ زیاتر کتێبی خوا نەناسان و سەربازەکانی شەیتان بخوێنمەوە..

بەڕاستی من چی بیرم لەخۆم ئەکردەوە لەکاتی نووسین و خوێندنەوەی ئەو سەرچاوانەدا بۆ نووسین..

دیمەن و تابلۆی چەند چرکەیەکی نیمچە منالّی خۆمم بیر ئەکەوتەوە کە لە سالّی (١٩٥٩) لە تەك هاوڕێیەکمدا لە ئاوایی (حاصل)ەوە ئەهاتمەوە بۆ مالّی خۆمان بۆ (سید صادق) کە گەیشتینە بەردەم ئاوایی (تەپەکەل) سەگەل داباڕینە خوارەوە بۆمان بەڵام چۆن داباڕینێك !

ئێمەش کە سەرودارمان پێ بوو پێکدا هەڵشاخاین و بڕمان کردن بەڵام سەگەلەکە زۆر دڕبون و بەگیریان هێنابووین حاجی فەقێ أحمد (بەگ)یش لەسەر بانیژەکەی خۆیانەوە هەر ئەیقیڕان کوڕە لە نوێژ ئەچن..

کوڕە گلاوتان نەکەن (ئێمە خەمی ورك دڕینمان بوو، ئەویش خەمی لەنوێژ چوون ).

٣. ئێستایش کە سەیری ئاوێنە ئەکەم و سەری بۆز و ڕیشی بۆز، ئەمەوێ ئەو بوارە .کە لە ڕاستیدا بۆ تەمەنی لاوێتی و گەنجی چاکە. بەجێ بهێڵم بۆ نووسەرە کارامە لاوەکانی ئیسلام خوا بەرەکەت بخاتە تەمەن و نووسین و وتەو کردەوەیانەوە منیش دەستم داوەتە نووسینێك کە خۆم حەزم لێی بوو لەلایەکەوە وە کتێبخانەی کوردی و ئیسلامی پێویستی بوو، لەلایەکی ترەوە ئەویش (فەرهەنگێکی ئیعلامی ئیسلامی کوردییە) بەناونیشانی (هەگبەکەی شارەزووری) ژیانی شۆڕە سوارانی ئیسلام و کورد بە کورتی لەسەر پیتەکانی (ئەلف بێ) پێشکەش ئەکرێ..!

ئەوەی ئەتوانێ دەستی یارمەتیمان بۆ درێژ بکات جێگای پاداشتی خوایی و ڕێزی ئێمەیە..

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين وصلى الله وسلم على سيدنا و شفيعنا محمد وعلى آله وأصحابه وأمته اجمعين.

ئاغجەلەر

١٤٠٥/١٢/١٦کۆچی

١٩٨٥/٩/١ زایینی

# سەرچاوەکان:

## سەرچاوە عەرەبییەکان :

١. القرآن الكريم

٢. تفسير القرآن الكريم، الشهير بتفسير المنار، محمد رشيد رضا، دار المعرفة، بيروت الطبعة الثانية.

٣. التفسير الكاشف، محمد جواد مغنية، دار العلم للملايين، بيروت، الطبعة الثانية، ١٩٧٨.

٤. الفهرس الموضوعي لآيات القرآن الكريم، محمد مصطفى محمد، وزارة الأوقاف العراقية مطبعة الأديب، ١٤٠١هـ.

٥. الكتاب المقدس، أنا جيل العهد الجديد، مترجم الى العربية، الطبعة الكورية، ١٩٦٧.

٦. فيض القدير شرح الجامع الصغير للسيوطي، عبدالرؤف المناوى، دار المعرفة بيروت، ط٢، ١٩٧٢.

٧. فقه السنة، سيد صادق، دار الكتاب العربي، بيروت لبنان، الطبعة الثالثة، ١٣٩٧. ١٩٧٧.

٨. احياء علوم الدين الأمام الغزالي، مطبعة مصطفى البابي الحلبي، القاهرة، ١٩٣٩م.

٩. مع الأنبياء في القرآن الكريم، عفيف طباره، دار العلم للملايين، بيروت، الطبعة السابعة، ١٩٧٩.

١٠. دراسة الكتب المقدسة في ضوء العلم الحديث، موريس بوكاي، دار المعارف، مصر، ١٩٧٧

١١. الروضة الندية شرح الدور البهية، صديق حسن علي الحسيني البخاري، دار المعرفة بيروت، ١٣٩٨\\١٩٧٨م.

١٢. ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين، أبو الحسن الندوي، الطبعة العاشرة، دار القلم كويت.

١٣ الحجاب، أبو الأعلى المودودي، ترجمة من الأردية محمد كاظم السباق.

١٤. حقوق الأنسان بين تعاليم الأسلام وأعلان الأمم المتحدة، محمد الغزالي، المكتبة التجارية، مصر، ط١، ١٩٦٣

١٥ الأسلام والجنس، فتحي يكن مؤسسة الرسالة، بيروت، الطبعة الثانية، .١٩٧٥

١٦ الدراسات النفسية عند المسلمين والغزالي بوجه خاص، عبدالكريم عثمان، مكتبة وهبة، ط١، .١٣٨٢

١٧. خلق الأنسان بين الطب والقرآن، د.محمد علي البار، الدار السعودية، الطبعة الثانية، ١٤٠١. .١٩٨١

١٨. الأسلام واتجاه المرأة المسلمة المعاصرة، الدكتور محمد البهي، دار الأعتصام.

١٩. المرأة بين البيت والمجتمع، البهي الخولي، مكتبة دار العروبة، القاهرة.

٢٠. حياة محمد، محمد حسين هيكل، مكتبة النهضة (المصرية)، الطبعة التاسعة، ١٩٦٥م.

٢١. نظرات في دراسة التأريخ الأسلامي، د.عبدالرحمان الحجي، دار الأرشاد بيروت، ١٩٦٩م.

٢٢. أفكار اسلامية، محمد المجذوب، مؤسسة الرسالة، بيروت لبنان.

٢٣. صراع مع الملاحدة حتى المعظم، عبدالرحمن الميداني، دار القلم دمشق، الطبعة الثانية، ١٩٨٠م.

٢٤. الدولة القانونية والنظام السياسي الأسلامي، د.منير حميد البياتي، دار العربية بغداد، ١٩٧٩م.

٢٥. الوجودية و واجهات الصهيونية، د.محسن عبدالحميد، الدار العربية، مكتبة القدس، بغداد، ١٩٧٧.

٢٦. المرأة في ظل الحضارة الغربية، د.محسن عبدالحميد، مكتبة القدس بغداد، ١٩٧٧.

٢٧. الطفل بين الوراثة والتربية، محمد تقي الفلسفي، الترجمة العربية، ط٢، مطبعة الآداب النجف، ١٩٦٩.

٢٨. نار تحت الرماد، د.مصطفى محمود، دار المعارف، القاهرة، ١٩٧٩.

٢٩. الحياة الجنسية في الأسلام، صباح السعدى، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٩.

٣٠. فمن رغب عن سنتي فليس مني، صلاح الدين عبدالمجيد، مطبعة الجمهورية، الموصل، ١٩٨٠.

٣١. الأسلام وقضايا علم النفس الحديث، د.نبيل محمد توفيق السالوطي، دار الشروق، جدة المطبعة الأولى، ١٩٨٠.

٣٢. على الفكر الأسلامي آن يتحر من سارتر و فرويد ودوركايم، أنور الجندي، دار الأعتصام، القاهرة، ١٩٧٩.

٣٣. نظرية فرويد، دراسة وتحليل، محمد علي الفلاحي، مكتبة القدس، بغداد، ١٩٧٦.

٣٤. التراث اليهودي الصهيوني والفكر الفرويدي، د.صبري جرجيس، الطبعة الأولى، مصر، ١٩٧٠.

٣٥. اصول علم النفس وتطبيقاته، د.فاخر عاقل، دار العلم للملايين، بيروت، ط٢، ١٩٧٨.

٣٦. دراسات في علم النفس، دحام الكيال، مكتبة الشرف الجديد، بغداد، الطبعة الثالثة، ١٩٧٧.

٣٧. تطور العلاقات الجنسية بين الرجل والمرأة، أحمد الشنتاوي، مكتبة الأنجلو المصرية، مصر، ط، ١٩٦٩.

٣٨. ماذا عن المرأة؟ د.نورالدين عتر، دار الفكر، دمشق، الطبعة الثالثة، ١٣٩٩هـ، ١٩٧٩.

٣٩. العقدة النفسية والشعور بالنقص عباس مهدى البلداوى، مطبعة الزهراء، بغداد، الطبعة الأولى، ١٩٧٨.

٤٠. الأنسان ذلك المجهول، د.الكسيس كاريل، الترجمة العربية.

٤١. خلاصة علم النفس، احمد فؤاد الأهواني، لجنة التاليف والترجمة والنشر، القاهرة، ١٩٣٨م.

٤٢. الهستريا، جزءان، فرويد وبرويد، ترجمه الى العربية، فارس طاهر، دار ومكتبة الهلال، ١٩٧٩م.

٤٣. موسى والتوحيد، فرويد، ترجمة الى العربية، جورج طرابيشي، الطبعة الثانية، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧٧.

٤٤. نظرة عامة في سايكولوجيا العلمية، فرويد، دار القلم، بيروت، الطبعة الأولى، ١٩٧٦.

٤٥. ثلاثة مباحث في نظرية الجنس، فرويد، ترجمة الى العربية، جورج طرابيشي، دار الطليعة، بيروت، الطبعة الأولى، ١٩٨١.

٤٦. ثاظلوظ و فرويد، هارى ويلز، ترجمة شوقى جلال، الهيئة المصرية للكتاب، الجزء الأول، ١٩٧٥ الجزء الثاني، ١٩٧٨.

٤٧. الجنس عند فرويد، د.مصطفى غالب، سلسلة في سبيل موسوعة نفسية، ٨، مكتبة الهلال، بيروت، ١٩٧٨.

٤٨. المرأة والاشتراكية، لينين وآخرون، ترجمة وتقديم، جورج طرابيشى، دار الآداب، الطبعة الثانية، ١٩٧٣.

٤٩. أسرار النفس، سلامة موسى، مطبعة التقديم، قاهرة، الطبعة الرابعة، ١٩٦٤.

٥٠. الأنثى هي الأصل، د.نوال السعداوي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، الطبعة الاولى، ١٩٧٤.

٥١. المرأة والجنس، د.نوال السعداوي، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، الطبعة الثالثة، حزيران، ١٩٧٤.

٥٢. قاموس مصطلحات علم النفس د.ماكدونالد لادل ترجمة يوسف ميخائيل أسعد، دار النهضة العربية، مصر القاهرة، .١٩٧١
٥٣. موسوعة علم النفس والتحليل النفس، انجليزي. عربي، عبدالنعم الحفني، مكتبة مدبولي، .١٩٧٥
٥٤. الجنس وآثره في السلوك الأنساني، دراسة وتقديم جوزيف كاسترو، ترجمة: فؤاد نصار، منشورات حمد، بيروت، .١٩٦٧
٥٥. مجلة (العربي) وزارة الأعلام الكويتية، العدد ٢٦٧، شباط، ١٩٨١.
٥٦. مجلة (حضارة الاسلام) السورية، دمشق، العدد٣، السنة ٩ـ ١٣٨٨هـ ١٩٦٨م.
٥٧. مجلة (آفاق عربية) العراقية، بغداد، العدد ٩، السنة ٣، آيار ١٩٧٨ و عدد١، السنة ٧، .١٩٨١
٥٨. مجلة (صباح الخير) المصرية، قاهرة، العدد ١٠٣١، يوم ٩، ١٩٧٥./١٠
٥٩. مجلة (كلية آداب) جامعة بغداد، العدد ٣٢، آذار ١٩٨٢ مقالة قاسم حسين صالح.
٦٠. مجلة (أسرتي) الكويتية، العدد ٣٥، سنة .١٩٨٢
٦١. مجلة (احياء التراث العربي الاسلامى) العراقية، العدد١٢، سنة ٣ دار الحرية بغداد .١٩٨١
٦٢. مجلة (الدستور) الانجليزية، العدد لندن ٢٦٥ يوم ١٢/٢٠/ .١٩٨٢

سەرچاوە کوردییەکان :

١. تەفسیری نامی، عبدالکریمی مدرس، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، دار الحریە، بغداد، ١٩٨١ز.
٢. تەفسیری نامی، عبدالکریمی مدرس، بەرگی چوارەم، دار الحریە، بغداد، ١٤٠٢ک ١٩٨٢ز.
٣. شەریعەتی ئیسلام، بەپێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی، عبدالکریمی مدرس، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی سلمان الأعظمی، بغداد، ١٣٩٠ی کۆچی ١٩٧٠ز.
٤. ژیانی پێغەمبەری مەزن محمد ﷺ، شێخ عبدالعزیز پارەزانی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کامەرانی سلێمانی ١٩٧٢. ١٣٩٢هـ.
٥. لە دەروازەی ئیسلامەوە شێخ عبدالعزیز پارەزانی، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی، ١٩٧٣ز.
٦. ئادەم پێغەمبەر (علیە السلام)، صلاح الدین محمد بهاءالدین، چاپخانەی دار الرسالە، بغداد. ١٩٨٠ز.
٧. نزیکترین دەرمانخانە، بکر غریب برزنجی، چاپخانەی الحوادث، بغداد، چاپی یەکەم، ١٩٨٢ز.
٨. ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا، صباحی غالب، چاپخانەی دار الحریە، بغداد، ١٩٧٩ز.
٩. تحفة مظفریة، ئۆسکارمان، ساخ کردنەوەی: هێمن موکریانی، بەشی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٥ز.

١٠. داروین لە تەرازووی ژێریدا . محمد ملا صالح شارەزووری، چاپخانەی الادیب البغدادي، بغداد، چاپی یەکەم، ١٩٨٢ز.
١١. ڕێکەوت لە تەرازووی ژێریدا۔ محمد ملا صالح شارەزووری، چاپی دووەم، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٨٠.
١٢. فەلسەفەی جوانی و هونەر، کمال مەمەند میراودەلی، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩.
١٣. کچانی کورد، گەشتێك لەناو ئافرەتانی موسڵمان لە کوردستان، هێمن هرۆڵد هنسن، گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی د.ناجی عباس احمد، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراقی، دەستەی کورد چاپخانەی کۆڕی ناوبراو، بغداد، ١٩٨٠.
١٤. خاتوو کلاوزەڕ حمە کریم هەورامانی، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، کتێبخانەی حیدری هەولێر، ٧٨٢.
١٥. شەهیدانی قەڵای دمدم، مصطفی صالح کریم چاپی دووەم، چاپخانەی علاء بەغداد، کتێبخانەی سلێمانی، ١٩٨٢.
١٦. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، سەر بە وەزارەتی ڕاگەیاندنی عیراق، ژمارە٨٩، ساڵی ١٩٨١.
١٧. گۆڤاری بەیان، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی سەر بە وەزارەتی ڕاگەیاندنی عیراق، ژمارە ٤٨و ٥٤ ساڵانی ١٩٧٨-١٩٧٩.
١٨. وە هەندێ سەرچاوەی تر کە لە پەراوێزدا دەست نیشان کراون.

# سەرباسەکانی ئەم کتێبە